

# ٢٥ ڕۆژ

## لەزیندانی فاشیەکانی بەغداد !

نووسینی

سەید قادر جەباری

٢٠٠١ سلێمانی

# ٢٥ڕۆژ لە زیندانی فاشیەکانی بەغداد (

# بەسەرهاتی قارەمانێکی نەتەوەی کورد

# لە ساڵی ١٩٧٧دا لە زیندانی ((هەینەی کەرکوک))

نوسینی: سید قادر جەباری

**پێشکەشە بە :-**

*گیانی پاکی شەهیدانی ڕێگای کوردو کوردستان و کەس و کاری شەهیدان

*ڕۆڵە نەسرەوت و خۆڕاگرو زیندانە سیاسی‌یەکانی کورد لە هەر جێگایەک دا هەن

*بە ئازادی خوازانی جیهان و خەبات گێڕانی کورد و کوردستان لە هەرجێگایەک دان

*ناوی کتێب : ٢٥ ڕۆژ لەزیندانی فاشیەکانی بەغدادا

*نووسینی : سەید قادر جەباری

* پیاچوونەوەی: جەمال ز،ری

* پیتچنین و کاری کۆمپیو،ری: هاوار سەیدقادر

*چاپخانەی: تیشك ت (٢١٢٦٩٥١) ، چاپی یەکەم ، سلێمانی٢٠٠١

*فەرز : سامان محەمەد ساڵح (بازاڕی سۆز)

*تیراژ : (٢٥٠)

*تابلۆکان: ئاراس حەمە حسێن، خەسرەو

*ژمارەی سپاردن: (١٨٩)ساڵی ٢٠٠١ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ دراوە

*وێنەی بەرگ: ئاراس حەمە حسێن

**پێشەکی‌یەک بۆ بیرەوەری ٢٥ڕۆژ لە زیندانی فاشی بەغدا ..**

بەڕێزو خۆشەویستم کاك سید قادر جەباری . دەست نووسی کتێبی ٢٥ڕۆژ لە زیندانی فاشی بەغدای نیشاندام . تاوەکو دیدو بۆچوونی خۆمی لەسەر دەربڕم .

وە بەهۆی ئەدەبەکەی کاك سید قادر جەباری و تێکۆشان و خەباتی زیاتر لە ٤٠ساڵ لە شۆڕش و پێشمەرگایەتی‌دا لە شاخ و لە ناو شاری کەرکوك بە نهێنی کاری ڕێخستنی ئەو دەمەی شۆڕشی ئەیلول دەکرد .. زیاتر هاندەرم بوو بۆ ئەوەی پاش خوێندەوەیەکی واقیع بینانە . شەرەفی ئەوەی پێ بەخشیم کە پێشەکی‌یەك بۆ کتێبەکەی بنووسم .

ناوەڕۆکی کتێبەکەی برای بەڕێز و نووسەر ، واقیعیەتی شێوازی ئەشکەنجەدانی ڕژێمی فاشی بەغداو چۆنیەتی مامەڵەکردنی شۆڤێنستانەی ئەو ڕژێمە بە شێوەیەکی (دیکۆمێنت)و بەبەڵگەوە دەسەلمێنێ ، کە چۆن ڕەفتارێکی دوور لە هەموو بەها مرۆڤایەتی‌یەکانی ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراقداخستۆتەڕوو ، کە هەر کەسێکی خەمخۆری کوردو کوردستان ، کاتێك تەنها کتێبی ٢٥ڕۆژی زیندانی شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەرانی کورد دەخوێنێتەوە ، لەو ڕاستی‌یە حاشا هەڵنەگرە تێ دەگات بە درێژایی دەسەڵاتی ئەو ڕژێمە تاکو ئێستا چ جۆرە ئەشکەنجەیەك دەکاتە ئامرازێکی تۆقێنەرانەو هیچ باکی لەوەش نەبووە کە منداڵ و ژن و پیاوی کورد ، چ جۆرە ئازارێك دەدرێن لە کاتێك ئەو ڕژێمە یەکێك بووە لەو دەوڵەتە دیکتاتۆریانەی کە هیچ حسابێك بۆ جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ نەکات بە کوردو عەرەب و کەمە نەتەوایەتیەکان ، تەنها لەبەر ئەوەی داوای مافی نەتەوایەتی خۆیان کردووە .. بە تایبەتی گەلی کوردستان کە چ پیلانێکی داگیر کەرانەی گرتۆتەبەر وە بە مەبەستی گلاوی سیاسەتی بەعس لەو پیلانەدا سڕینەوەی

کەلتورو لەناو بردنی کەڵە تێکۆشەرانی گەلەکەمان ، کە لە ڕەگەوە میللەتێك وەك کورد ڕیشەکێش بکات .. تا بەو پیلانە ژەهراویەی خۆی بگات ..!
کتێبی بیرەوەری ٢٥ ڕۆژی زیندانی‌یەکی کورد ، بە شێوەیەك ئاماژەی پێ کردووە تاکو ئەو گەلانەی داوای پێشێل نەکردنی مافی مرۆڤ دەکەن ، وێڕای ئەو هەموو مەرگەساتە تراژیدیایەی بەسەر کوردا هێناویێتی . کاکی نووسەر ، ئەم ٢٥ڕۆژەی مرۆڤێکی کوردی شۆڕشگێڕی ئاوێتەی کارەساتە شۆڤێنیەکانی بەعس دەکات وبەمەش ، ڕووی دزێوی ئەو ڕژێمە زیاتر ئاشکرا دەکات .

نووسەر بە بیری تیژی بە پێی ئەوەی خۆی مرۆڤێکی کورد پەروەرە ، ڕوداوەکانی هێناوەتە سەر ئەوەی ، زیرەکانە و بە هۆی ئەو ئەزموونە شۆڕشگێڕییەی خۆیەوە واقیعێکمان پیشان ئەدات ، کە پڕاوپڕە لە هەستی نەتەوایەتیو تاکە ڕێگاچارەشیبۆ ڕزگار بوونی کورد و عەرەب و کەمینە نەتەوایەکان تەنها گرتنەبەری شۆڕش و بەرخۆدانەو لە زمانی پاڵەوانی ئەو نووسینەیەوە ، فێری خۆڕاگری و گیان بازی مرۆڤی کورد دەکات ، کە وەك کەسایەتیەکی بە هێز لە ئازارو ئەشکەنجەدان دا نەك جەللادەکانی بەعس نەتوانن بۆ تاکە ساتێك چی‌یە سوود لەو مرۆڤە خۆنەویستیانەی کە گیانیان پێشکەش کردوە بە کورد و کوردستان وەرگرن ، بە پێچەوانەوە (مردن) و شەهید بوون دەکەنە بەردەبازی ڕزگاری و سەربەخۆیی یەکجارەکی کوردستان .

ئەمە وانەیەکی شۆڕشگێڕی‌یە بۆ هەموو کوردێکی دڵسۆز ، کە پاراستنی کوردو کوردستان ئامانجی سەرەکی بێت .. ئەمە ئەو خەسڵەتە شۆڕشگێڕییە کە تاکوردێك هەبێ .مەحاڵە دیکتاتۆرەکەی بەغدا بتوانێ شۆڕش لە لە شۆڕشگێڕان بەلا ڕێدا بەرێ ..

ـەر بۆیــە بــرای نووســەری ئــەم کتێبــە . قارەمــانێکی نێوزیندانــی
دۆتەخەسڵەتی نوسـینەکەی کـە ڕووداوێکــی مێژوویــی ڕاســتەقینەی
لەکەمانە ، کەسایەتیەکی لێهاتووی نەبەزو خۆڕاگـری نەتـەوەی کـوردە و
شانیش پێشمەرگەیەکی گیـان لەسـەر دەسـتەو ململانـێ لەگـەڵ مـەرگ دا
کـات و بـێ پسـانەوە و بـەردەوام لـە کـارو چـالاکی لەسـەر لووتکـەیچیا
ەرکەشەکانی کوردستانەوە ، دەنگــی ئـازادی هـەر بەرزو پـیرۆزی خـاك و
شتمانی کوردستان (بـە تـێزی نەتـەوەیی کـورد) بەشـەکاوەیی ڕاگرتـووە ،
ئەمـەش بەڵگەنەویستێکی تـری ئــەم قارەمانــە بــووە لــەدوای زیندانــی
شییەکانی بەعس دا .
وسـەر لـە زمـانی قارەمـانی نێـو زیندانـەوە پـەردە لەسـەر ئـەو شـێوازی
ژمنکارانـەی بەعسـییەکانی صدامـی خوێـن ڕێـژ لا دەدات و دڕندەیـی و
شکەنجەو لە سێدارەدانی ڕۆڵەکانی کورد لە دادگایەکی بێ دادا بە دنیـای
وەوەو دەرەوە ئاشکرا دەکات .
ۆکاری ئەو دڕندەییەی ڕژێمی بەعس بەرامبەر کورد ، هەر ئەرەبووەکە تەنها
وردن ، ئـەو ئەشـکەنجەدان و شـێوازە نامرۆڤانـەی بەعسـیش بەرامبـەر بـە
ۆڵەکانی کورد لە زیندانـدا تەنها ئەوەیە کە دانبنێت بە کارێکی سیاسـی ،
اوەکو لـە ڕێگەیچەند کـە سـێکەوە تاڵـە داوەکـانی ڕێکخسـتنی ناوشـاری
ۆڕشی کورد ئاشکرا بکرێ ..
ە لە ڕاستیدا قارەمانی کتێبەکەی برای نووسەر نەك هـەر هیچی نەدرکاند
ەڵکو چۆکی بە دوژمن دادا .. وە لە هەمان کاتدا لـە ژێـر فشارێکی بەدەر لە
ـرۆڤ و مرۆڤایـەتی هـەندێك شت ڕێك دەخـەن تـاوەکو کەسـە زیندانییـە کـە
چێتـە ژێـر ئـەو فشارەوە ئەمـەش وەك بەهانەیـەکی بەعسـییەکانە ، تـاوەکو
یندانییە خۆڕاگرەکان بکوژن و لە ناویـان بەرن . دواتریـش تـا بـەرژەوەندی
ەم ڕژێمە لە ناوچەکەدا هەبوو هەرچی بکردایە بۆیان دادەپۆشی لـە پێنـاوی

لیتریّ نەوت ، هەر بۆیە ئەو نەسلمینەوەی رژێم و دارو دەستەوخوێن رێژەکەی بەغدا ، رۆژ لە داوی رۆژ کارەساتی جەرگ بڕ و کرداری نامرۆڤانەی عەرەبە بەعسی یەکان لە عێراقدا بەسەر نەتەوەی کوردا ، زیاتر زەمینەی جێ بەجێکردنی پیلانەکانی دەهاتە دی .. وەك بێ سەرو شوێن کردنی هەشت هەزار بارزانی و ئەنفال کردنی (١٨٢)هەزار مرۆڤی کورد بە کوڕو کچ و منداڵ و ژن و پیاوەوە بێ سەرو شوێن کردنیان هەر بە زیندویتی و زیندە بە چاڵکردنی ئەنفالە بەدناوەکەی رژێم ناوچەکانی گەرمیان ، قەرەداغ و کیمیاباران کردنی شارێکی وەك هەڵەبجە بە درەخت و بەروبووم و ئاژەڵ و مرۆڤەکانیەوە شەهید کردنی شاریّ لە ١٩٨٨/٣/١٦دا ، پەردەی تاوانکاری بێ ئابڕووی رژێمی بەعسی عەرەبی عێراقی ئاشکرا کرد .

پاشان کیمیابارانی هەموو ناوچەکانی هەرێمی کوردستان بە تازەترین چەکی کۆکوژ و بە کارهێنانی قەدەغەترین چەك لە جیهان دا وەك گازی خەردەل و سیانیدو کیمیاوی ، بکا بەسەر گەلێك دا کەلە عێراقدا دەژین .. ئەم کردارە ئەو پەڕی سوکایەتی کردنی ئەم رژێمە لەبەردەم رای گشتی جیهانی‌د دەخاتە ڕوو هەر

تەنها لەبەرئەوەی کوردن وداوای مافی خۆی دەکات ؟!

هەرچەندە رژێمی بەعس و صدامی جەللاد ئەم کارە نامرۆڤانەیەی ئەنجام د بەلام چەند وولاتێکی تریش تۆمەتبارن بەوەی کە چەکی کیمـاوی ، جەرسۆمی و خەردەل و سیانیدیان پێداوە بۆ خاتری نەوت .. خۆیان بـ دەنگ کرد لە ئاست ئەو هەموو تاوانانەی کە رژێمی عێراق پێ‌ی هەستا دژ ب نەتەوەی کوردی ماف زەوتکراو خاك داگیرکراو .. بەلام دۆسیەی تاوانەکانم جینۆساید و تاوانباری جەنگی عێراق ـ ئێران و داگیرکردنی دەوڵەتی کوێـ بەوە کۆتایی نایەت گەمارۆی ئابووری بۆ شمەك و کالای مەدەنی لابچێ

بەڵکو ئەمڕۆ بێت یاسەی چارەنووسی لە تەواوی دیکتاتۆرەکانی تری جیهان کەمتر نابێ ؟!

بەڵام ئەوەی مایەی تێڕامانە . ئەو هەموو تاوانەی دژ بە گەلەکەمان و بە زۆر شەڕ فرۆشتنی بە کۆماری ئیسلامی ئێران و داگیرکردنی کوێت و قەتڵ و عامی خەڵکی بەش مەینەت و ستەم دیدەی گەلەکەمان و ئەنفال و کیمابارانکردن بەبەرچاوی وڵاتانی ئیسلامی وجیهانی عەرەبی و بیانییەوە ئەنجام دا ، بە مەرجێ هیچیان فرمێسکێ تیمساح ئاساشیان لەو دەمەدا بۆ کورد نەڕشت ، وە هیچ ویژدانێکیش بۆ تاکە ساتێ نەبزواو بە ژێر لێوانیشەوە باسیان لێوە نەکرد تەنانەت بیروباوەڕە سۆسیالستی زانستی و سۆسیالستی دیموکرات و لایەنە دیموکرات خوازەکان بە دەنگ کێشەی بە ئەنفال کردن و کیمابارانی کوردانەوە نەهاتن ..؟!

ئەم کتێبەش کە برای بەڕێز کاك سید قادر جەباری دایڕشتوەو ڕوداوێکی واقیع بینانەیە . دەست خۆشی لێ دەکەم بە هیوای ئەوەم نمونەی ئەم جۆرە دیکۆمێنتانە هەر لە برەودابن .

هەر بژیت .

برات

زەردەشت هورمزیار

پێشەکی – وتەی نووسەر

خوێنەری بەڕێز . پێم خۆشە لە ڕێگای ئەم پەرتوکەوە پێتان دەگەم . و نووسینی ئەم پەرتووکەش ڕووداوێکی مێژوویی‌یە ، بە شێوەیەکی‌واقیع بینانەوە هەوڵم داوە ڕووداوەکان وەك خۆی بنوسم ، ڕووداوی کەڵەمێردێکی گیان لەسەر دەست و پێشمەرگەی بە وەفای کوردو کوردستانە ، کە دەربارەی زیندان کردن و ئەشکەنجەدانی ئەو مێرخاسەی کوردە کە بە

ماوەی ٢٥ڕۆژ لە زیندانی‌یەکانی ڕژێمی بەعسەیەکانی عێراقدا ئەشکەنجە دراوە !

گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ڕۆڵەیەکی بەوەفای کورد ، گێڕانەوەو مێژووی هەموو شۆڕشگێڕییەکی کوردە کە لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەی بەعسی‌یەکان دا بوێرانە و بێ سڵەمینەوە لە جەورو ستەمی ئەو دڕندە بێ ویژدانە خۆڕاگر و ژیرانە توانیویانە ڕزگاربن ، یا گیانی خۆیان بەخت بکەن بە کوردو کوردستان .

ئەم مێرخاسە و خۆڕاگرەش ، ژیرانە و بە هەڵوێست لە کاتی ئەشکەنجەدانی‌دا ، ڕقی پیرۆزی ، ئەستوورتر دەبێ و بۆ تەنیا وشەیەك ئەو ڕژێمە فاشستەی بەعس نەتوانن سوودی لێ وەربگرن ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەتوانێ گیانی خۆی و نهێنی‌یەکانی شۆڕش ڕزگار بکات و بپارێزێ و چۆك بە دوژمنی خوێن خۆرو داگیرکەری کوردستان دابدات بۆ جارێکی دی بیسەلمێنێت کە داپڵۆسین و گرتن و هەڵواسین و ئازار و ئەشکەنجە و کوشتنی بەکۆمەڵ نابێتە هۆی چۆك دادانی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان و وەگیانی خۆڕاگری و بەرنگاربوونەوەی نەتەوەیەکی زوڵم لێکراو چەوساوە کز ناکات ، بگرە گڕو گڵپەی ئاگری شۆڕش و شۆڕشگێڕان زیاتر و زیاتر دەبێت و دەنگی ئازادی خوازانەی نەتەوەی کورد ، گوێی داگیرکەرانی کوردستان کەڕ دەکات و سەرکەوتنی یەکجارەکی بۆ گەلەکەمان بێتە دی ...

چەمکێکی تری ئەم پەرتووکە دەبێتە فاکتەرێکی گرنگ بۆ هەڵماڵینی ئەو زوڵم و زۆرداریيەی کە ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا دژ بە مافەکانی مرۆڤ و ئازادی ڕادەربڕین و مافی ڕەوای خەڵکی کوردستان بە کاری دەهێنێ ئەم ڕژێمە ڕۆژانە بە دڕندانەترین شێوە پەلاماری ڕۆڵەکانی کوردی داوە ، هەر لە پیر و لاو ژن و منداڵ دەستی نەپاراستووە و بەردەوامیشە لەسەر ئەو سیاسەتە فاشستی‌یەی .

ڕووداوەکانی ئەم پەرتووکە باس لە جۆری ئەشکەنجەدانی ساڵەکانی ١٩٧٧ دەکات کەچەند بە دڕندانەترین شێوازی ئەشکەنجەدان کەوتووتە گیانی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان و بێ بەزییانە مامەڵەی لەگەڵ تاکەکانی نەتەوەی کوردا دەکات ، بە مەبەستی بنەبڕکردن و سڕینەوەی کلتوورو فەرهەنگی نەتەوەیی کوردستان وبە زۆر بە عەرەب کردنی بەعسیانەی بەرامبەر گەلێك کەلەسەر خاکی زێدی باب و باپیرانی خۆیان لە نیشتمانی خۆیان دا دەژین کە پێی دەوترێ ((کوردستان)) .

وەلێ لە بەرانبەر بە کارهێنانی دەزگا سەرکوت کەرەکانی ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا تادەهات ورەی پۆلاینی شۆڕشگێڕانی کورد چ لە زیندان دا بێ چ لەمەترێزی پێشمەرگایەتی دا مەکۆم تر دەبوو . هەر چەندە پێ بە پێ گەشەکردنی تەکنەلۆژیای سەربازی ڕژێم و تەرخان کردنی بودجەی عێراقی بۆ کردنەوەی (تصنیع العسکری) بە کار دەهێنا و بەمەبەستی مل کەچ بوونی نەتەوەیەکی وەکو (کورد) .

تەکنەلۆجیای ئەشکەنجە و دام و دەزگای سیخوڕی و ئازاردان و کوشتو بڕ ، ڕژێمی داگیرکەری عەرەبی بەعسی عێراقی لە ڕێگای وولاتانی دژ بە مرۆڤایەتی ، تا دەهات ڕەفتاری فاشیزمانەی کردبووە تاکە ئامێرێك بۆ نەمانی شۆڕشی کوردو شۆڕشگێڕانی کوردستان ، ئەم ڕژێمە وەك ئەوەی هەوڵی باشکردنی ژیانی گەلانی عێراقی بدایە و ڕێگای وتوێژی ئازادانە و فەزایەکی دیموکراتی لە عێراقدا پراکتیزە بکردایە ، بەڵام تاکە ڕێگای ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا ، لەسەر سیاسەتێك پیلانی گڵاوی دادەڕشت ، ئەم جارەیان بە تەکنیکی سەربازی نوێوە پیادەی ئەو بەرنامە دژ بە مرۆڤایەتیان گرتبووە بەرو شێوازی تازەی ئەشکەنجەدانی کردبۆوە گەواهی فاشیستانەی .. دژبە گەلانی شۆڕشگێڕی عێراق بە گشتی و نەتەوەی کورد بە تایبەتی .. (ڕژێمی داگیرکەری سەدامی) ، لە بواری پەیوەندیە

دەرکی‌یەکانی دا ، هەموو ورزەو توانی خستۆتە گەڕ ، لە پێناو نمایش کردنی دەسەڵاتە لەرزۆکەکەی تاوەکو هەڵمەتێکی بەناو دیبلۆماسیانەی سیستمی ڕژێم و دەستەو تاقمەکەی ، بە پاساو بهێنێتەوە ، بە پێچەوانەی ئەم هەڵمەتە دەرەکی‌یەی پیاوانی ڕژێمی بەعس فۆرمەلەکردنی بەرنامەیەك بوو نەك هەر لە ناوخۆو عێراقدا نەیتوانی هیچ شیکارو پاساوێك بهێننەوە بۆ کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی و مافی جیهان ، بەڵکۆ هەموو شێوازێکی ئەشکەنجەدان و گرتن و ڕاوەدوونان و پیادەکردنی سیاسەتی (تەرحیل ، تەعریب ، تەهجیر) و سەرنگوم کردنی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان و کردەوەی جینۆساید و شەڕنگێزی بۆ وولاتانی دراوسێی خۆی و وولاتانی بڕیار بە دەست ئاشکرا بوو لە ڕێگای میدیاکانی جیهانەوە .. کە بەچ شێوازێك هیچ حسابی بۆ نەتەوەی کورد نەکردووەو ئەوەی لە توانایدا بووبێ ، درێغی نەکردووە .. بە نوێترین تەکنەلۆژیای سەربازی نیشتمانی کوردستانی کردبۆە سوتماك و لە زیندانی‌یەکانی (ئەبوغرێب ، کۆشکی نیهائی((قصر نیهائی)) و کوشتارگەی قەسابخانەی موصڵ و هەیئەی کەرکوك و نوگرە سەلمان و دەشتی عەرعەر) کە ئێستاش سیخناخی کردووە بە کوردە شۆڕشگێڕەکان و کەمینە نەتەوایەتی‌یەکان لە عێراقدا بە تەنهاش تاوانی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردمان ، سووربوون بووە لە بەدیهێنانی مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان لە عێراقێکی دیموکراتی فرەحزبی پەرلەمانی یەکگرتوودا .

کە مافێکی نیشتمانی نەتەوەیی گەلێکی چەوساوەو زوڵم لێکراو بووە ، بۆ شیکاری ئەم بەڵگە نەویستەش تەنها تاوانی ئەو ڕۆڵانەی کورد هەر ئەوە بووە کە کوردن بە کوردی دەژین و دەمرن و داوای مافی چارەنووسی خۆیان دەکەن ، ئەم سیاسەتە هستیریانەی بە دڕندەترین ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا بە زۆرو داپڵۆسین ڕووبەڕووی نەتەوەی کوردی کردبۆوە .. ڕژێمی بەعسی عەرەبی عێراق هەمیشەو بەردەوام لە بۆسەدا بووە ، کە شۆڕشی

ەتەوەی کوردستان سەرکوت بکات و دواتر زیاتر و زیاتر (( هەمیشە لە بیلانی نەگریسی خۆی نەکەوت ، بە واتا شەڕێکی خوێناوی دژ بە گەلەکەمان ساڵەهای ساڵە درێژەی پێداوە)) .
چەندین فاکتەر هەیە کە ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراق هەوڵی بۆ داوە :
/بڕوا نەبوونی ڕژێم بە پرۆسەی دیموکراتی لە عێراقێکی فیدراڵ و یەکگرتوودا .
ب/ ڕژێمی بەعسی سەدامی هیچ کات بڕوایان بەو چەمکە عەقڵانیە نەبووە کە هاوڵاتیان و لایەنە سیاسەیەکانی و کوردستان و عێراق جاڕی هەڵبژاردنێکی گشتی بدات .. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەو کردنی سیستمێکی شۆڤێنی کە تەنها حزبی بەعسی عەرەبی سەدامی پەیڕەوی دەسەڵاتی عێراقی لەدەست دەر نەچووە ، بۆ شیکارو سەلماندنی ئەو ڕاستی‌یە بەڵگە نەویستە ، ئەوەی بە کوردی کوردستانی عێراقی کردووە ، بە سەدان پەرتووك تەواو نابێ ، ئەو بەسەرهات و زیندانییەی پاڵەوانی ڕاستەقینەی کوردستان مشتێکە لە خەروارێك .. ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامانە بە درێژایی مێژوی بە زۆر خۆسەپاندنی سەدامی دیکتاتۆر ، بۆتەنیا چرکەیەك ویژدانی نامرۆڤانەی نەبزواوە بۆ بونیادی عێراقێکی دیموکرات و فرە حزبی و پەرلەمانی . کە گەلانی عێراقی دووچاری دۆزەخێك کرد ، کەئەمەش نیشانەی شەڕەنگێزی و لە خۆبایبوونی بوونی ئەو ڕژێمە دەسەلمێنێ کەبونیادی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی شۆڤێنستانەی گەواهی ڕەفتارەکانی ئەو سیستمە تۆلیتارستی‌یە پشت ڕاست دەکاتەوە هەر ئەم شێوازە دڕندانەی سەدامی خوێن ڕێژ بوو کە ساڵانی دواتر و زیاتر (هەمیشە سوپا بەزیوەکەی وەك ئالیەتێك بە دڕندانە ترین شێوازی نا مرۆڤانە هەمیشە لە بۆسەدا بوون لە بۆ کورد ... وە دەستی کرد بە کاری چەپەڵانەو بێ ئابڕوو بەرانەو بە کۆمەڵ کوشتن و ئەشکەنجەدان خستەڕوو !بەبەرچاوی

هەموو جیهانەوەو وە بە ئاگاداری ئەو حکومەتانە کە دەیانەوێت مافی مرۆڤ پراکتیزە بکرێ وە بە ئاگاداری هەموو حکومەتەکانی جیهان ، هەر بە کۆمەڵ کوشتنی هەر لە زیندانەکان وبە کۆمەڵ کوشتنی خوێندکارە لاوەکانە کە بە درێژایی لە ژێر فشاری نامرۆڤانەی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا ، سادەترین مافیان پێ ڕەوا نەبینیون وە کردەوەی دژە مرۆڤانەی ڕژێمی بەعسی لە عێراقدا یەکێك بوە لە کردەوەی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ، بۆ مەرامی خۆیشی فشاری ئابووری ، سیاسی (پەروەردەیی) کۆمەڵایەتیو ...هتد .
لێرەوە هەمو سات و ڕۆژگارێك لە جیاتی زمانی دایەلۆگ و کۆتایی هێنان بە کێشەکانی ناوەوەی عێراق وکوردستان ، هەرچی شێوازێك دژ بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی نەتەوەی کورد کردبێتی درێغی نەکردوە ، هەر لە سێدارەدانی تێکۆشەرانی ڕوناکبیرو سیاسییەکانی گەلەکەمان ، لە جیاتی ئازادی و پێکەوە ژیانی هەردوو گەلی کوردو عەرەب لە عێراقدا بە شێوازێکی تۆقێنەرانە سیاسەتە شۆڤێنییەکانی درێژە پێ دەدات .. مەبەست لەم پەیڕەو کردنی سیاسەتەشی وێڕای چەوسانەوەی نەتەوایەتی دژ بە گەلی کورد و هێزە ئاشتی خوازو نیشتمان پەروەرەکانی نەتەوەکەمان درێغی نەکردوەو دەستی نەپاراستوەو بەردەوامیش هەوڵی داوە بۆ سڕینەوەی کەلتور و فەرهەنگ و دابو نەریتی نەتەوایەتی کورد ، تەنانەت لە زۆر جێگادا کە لە ژێر دەسەڵاتی سیستمی شۆڤێنی بەعسی عەرەبی عێراقیدان کە تاوەکو ئێستاکەش ڕێگەی ئەوەی نەداوە خەڵکی ئەوناوچەئازادنەکراوانەی کوردستان بە زمانی زگماکی نەتەوەکەی خۆی ئاخافتن بکات ، کە ئەم بڕگەیە مافی سەرتایی هەموو نەتەوەو گەل و مرۆڤێکە ، ئەو بەرنامە دژە مرۆڤایەتییەی دەسەڵاتدارانی بەعس بە شێوەیەکی دڕندانە دەبینرێ و ساڵ لە دوای ساڵیش ئەم ڕژێمەی کە دەسەڵاتی بە زۆر سەپێنراوی بە سەر گەلانی عێراقدا گرتووە ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو خراپترین شێوازی شۆڤێنیانەی

بۆته بەر ، ئارمانجیش لەو سیاسەتەی بەعسی عەرەبی لە عێراق دا لە
ەرینتێکی دوژمن کارانە بەکار دەهێنرێت ، بە تایبەت خەڵکی ناوچەکانی
رمیان و کەرکوك و خانەقین و شەنگارو ئەو شوێنانەی دی کە تا ەەنوکەش
ە هەزارەی سێهەمی مێژوودا لە ژێر چەنگاڵی بەعسی فاشی عێراقدا
ەناڵێنن ، وەلی چەندین دیکۆمێنت و بەڵگە نامەوە شێوازی مامەڵەو
پلۆسین و بەعس دژ بەنەتەوەکەمان بە بەڵگەوە بوونی هەیە ، بەلام
ەیوەندی بەم باس و نوسینەوە نی‌یە بۆیە ئەم توانی باسی لێ بکەم وەك
ئنفال کردنی سەدو هەشتاو دوو هەزار کەس لە ژن و مناڵ و پیرو گەنج کە
ە بڕیارێکی قەرەقوشانە سەرنگومیان بکات و تا ئەمڕۆکەش هیچ
مۆراخێکیان نی‌یە و گەلانی بالادەستیش لەم تاوانە گەورەیە خۆیان بێ
ەنگ کردووە هەروەها بێ سەرو شوێن کردنی هەشت هەزار مرۆڤ لە
اوچەکانی بەرزان ، دواتر بە دڕندانەترین کردەوەی وەحشی گەری ، ئەم
ژێمە لە بەرواری ١٩٨٨/٣/١٦دا بە قەدەغەترین چەك کەلە یاسای نێو
ەتەوەیدا قەدەغەکراوە بە گازی خەردەل و سیانید و کیماوی بە هەزاران لە
ۆڵەکانی شاری هەڵەبجەی شەهید لە چەند خولەکێك دا کیماوی بکات و بەم
ردەوەیەش ڕژێمی بەعس لە عێراقدا هەڵەبجەی شاری شاعیران و نووسەران
ـ مەڵبەندی ڕۆشنبیری ، بە مرۆڤ و دارو باڵندەو گیان لەبەرانەوە بەگازی
خەردەل و سیانید بخنکێنێ . ئەم ڕژێمە هەر لە سەرتایی خۆسەپاندنی
ەسەر گەلانی عێراقدا هێندە تاوانی دژ بە گەلی کورد و ڕۆڵەکانی گەلانی
ێراق کردووە ، کە هیچ پاساوێك نی‌یە بۆ پارێزگاری کردن لە خۆی !
ڕژێمێك دەستی خوێناوی گیر بکات لە گەل و نەتەوەکەمان ، ئیدی پاساو بۆ
ڕژێمێکی داپلۆسێنەری وا نەك هەر شیاوی ئەوە نی‌یە لە لایەن چەند
ولاتێکی گەورەوە بهێڵنەوە .... ڕژێمێك دەستی پڕ لە تاوانی گیر بکات و
بتوانێ زیاتر لە چوار هەزارو پێنج سەد گوند بە گوندی کوردستان بکاتە

سوتماك نەبێ گەلانی عێراق بە كوردو عەرەبە شۆڕشگێڕەكان و كەمە نەتەوایەتی‌یەكان ، چۆن متمانەیان لادروست دەبی ؟.. ئەوە جگە لە شێوەی بە كارهێنانی بە كۆمەڵ كوژی و شەڕی بە زۆر سەپێنراوی دژبە گەلی كوردستان و سڕینەوەی نەتەوەیەكی وەك كورد لەسەر خاك و نیشتمانی كوردستاندا و بنەبڕكردنیان ، تەنیا لەبەر ئەوەی ساڵەهای ساڵە نەتەوەكەمان دەیەوێ‌مافی ڕەوای چنگ كەوێ لە جیاتی زمانی دانوستان و ئاشتی‌و پێكەوە ژیانی گەلی كوردو عەرەب و كەمە نەتەوایەتی‌یەكان ، ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا ، سیاسەتی (ئاپارتایدApartaid) یان بەكارهێناوەو بێ گوێدانە مافی مرۆڤ و بەندەكانی جاڕی گەردوونی‌مافی مرۆڤ و وولاتانی ئاشتی پارێزیەلای مەسەلە ڕەواكانی گەلەكەماندا پشتیوانیەك دروست بكات چونكە ڕژێمی عێراق بەهەموو شێوازێكی دڕندانە كەوتوتە لەناوبردنی‌ڕۆڵەكانی گەلەكەمان و هیچ دەروازەیەكی بە جێ نەهێشتوتەوە كە نەتەوەكەمان ڕێگای تری شۆڕش و قوربانی دان بگرنەبەر ئەم ڕێگەیەش تەنیا بۆ بەرگری كردن بووە لە بوون و كیانی سیاسی گەلی كورد لە كوردستانی عێراق دا كە دژ بەو سیاسەتە شۆڤێنستیانەی ڕژێمی عێراق بوەستنەوە ؟ بە پێچەوانەی عەقڵی سەردەم ،ڕژێم كوردستانی‌هەمیشەو بەردەوام بە درێژایی ساڵ كردۆتە جێگەی تاقی كردنەوەی چەكە كۆكوژو چەكە بالیستی‌و چەكی كیمیاوی‌یەكانی ..

كورد واتەنی : شەلم كوێرم ناپارێزم . ئەمە پەندێكی دێرینی كوردەواریو گەرمیانی‌یە بەواتا ، ڕژێمی بەعسی فاشتی عێراق بۆ تاكە خولەكێك دەستو لە گەلەكەمان نەپاراستوە و بە ئاشكرا درێغی لە سیاسەتی (تەعریب تەرحیل ، تەهجیر ، تەبعیس)ی دژ بە كوردان نەكردووە و كۆڵیشی لە، سیاسەتە ڕەگەز پەرستانەیەی خۆی نەهێناوەو بەبەردەوامی پەیڕەو؛

سیاسەتێکی داپڵۆسێنەر دەکات ، بێ گوێدانە بڕگەو یاساکانی نێو دەوڵەتی

خوێنەری بەڕێز ..
لێرەوە بڕوانەو گوێ بیستی ئەو کردارە چەپەڵ و ناڕەوایانەی ڕژێمی بەعس بە کە چۆن لە سەدەی نوێی جیهانیدا ڕژێمێك بە هۆی دارو دەست و تاقمە خوێن مژەکەی ، تەواوی گەلانی عێراق تا هەنوکەش بەردەوام لە گرتنەبەری ئەو سیاسەتەی ، سیاسەتێك کە لە هەزارەی سێهەمی مێژوودا چەند دیکتاتۆرێکی‌وەك خوێن مژی گەلانی عێراق (صەدامی جەلاد) درێژە بە ڕەفتارە دژبە مرۆڤایەتیەکانی خۆی بدات ، لە پێناوی مانەوەی لەسەر کورسی دەسەڵاتی دیکتاتۆریەت ، لە بەرامبەر خوێندکارو خوێندنگاکان ئەنجامی دەدات ، ئیتر بێ گوێدانە ئەوە خوێندکارە(مێ) بێ یا (نێر) بێت یا (لاو)بێ ؟!
لە ١٢سالانەوە تا ١٤ساڵ بەر هێرشی دڕندانەی پیاوانی ڕژێمی بەعس بوونەتەوە.
بە واتا هیچ پێوەرێك نی‌یە لەلای ڕژێمی بەعسی‌عێراق، بەڵکو پێوەری ئەم ڕژێمە سیخناخ کردنی ژوورەکانی زیندانە بە هەموو شێوازێکی ئەشکەنجەدان پڕکردووە؟!
فاشیەتی ئەو ڕژێمە خۆی لەوەدا بەرجەستەکردووە ، کە هەمووشت بۆ خۆی ڕەوایە بالەژێر هەر ناوێکیش دا بێت ؟!
وە گۆڕینی ڕگەزی کورد بەزۆرو بە عەرەب کردنی دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتێکی شۆڤێنستی ڕژێم کە (تەرحیل ، تەعریب ، تەهجیر ، تەبعیس) لە کەرکوك و جێگاکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم بەبەرچاوی حکومەتەکانی جیهانەوە و کردنەوەی چەند گەڕەکێ لە شاری دێرینی کوردان (کەرکوك) بۆ نیشتەجێ کردنی عەرەب .!! تاوەکو مێژووی ئەو شارە کوردانەی کە

ماونەتەوە ، بە درێژیی دوای ڕاپەڕین وپێش ڕاپەڕین بکاتە شارێکی بە زۆر بەعەرەب کراو .

لە بەرامبەر ئەو سیاسەتە دژە مرۆڤییانەی ڕژێم ، کورد پشت ئەستوور بە جەماوەری شۆڕشگێڕی گەلەکەمان بە دڕندانەترین شێوە مامەڵەی لەتەك دا کراوە بەڵام پشووی شۆڕشگێڕانەو ورزەو توانای نەپساوەی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان ، گەواهی ئەو ڕاستی یە بەڵگەنەویستەیە کە نەك هەر چۆك دانادات نەتەوەی کورد ، بەڵکو ڕقی پیرۆزی زیاتر ئەستوورتر دەبێ ، ئیتر لە زیندانی فاشیەکانی بەعس دا بێ یا لەبەردەم پەتی سێدارە زیاتر و زیاتر بیری ڕۆڵەکانی گەلەکەمان فراوانتر دەبێ ، ئەمە جگە لەوەی کە گەلەکەمان ((گەلی کوردستان)) لەتەك ئەو سیاسەتە داپڵۆسێنەرەی بەعس دا بە واقیعی سەلماندویەتی بۆ دۆستانی ودوژمنانی لەدەرەوەو ناوەوە ، کە کورد هەمیشە ئازادی خوازەو خەباتیشی درێژە پێداوە تاوەکو لە ڕێگای ئاشتی یەوە چارەسەری کێشە ڕەواکانی خوێی پێ بکات و لە پرینسپی نەتەوەکەمان دا چەمکی ئاشتی و دیموکراتی و پێکەوە ژیانی گەلانی عێراق بە ڕێگای وتوویژ باشترین ڕێگا بۆ عێراقێکی دیموکراتی فرە حزبی پەرلەمانی لە سەر سیستەمی فیدراڵی ، هەر لەم پێناوەشدا چەندین دوژمنی سەرسەختی گەلی کوردستان ، لەبری ئەوەی زمانی ووتوویژ و ڕێگا چارەی ئاشتیانە بگرێتەبەر ، بە پێچەوانەوە ڕژێمی بەعس و دەسەڵاتدارانی خوێن مژی گەلانی عێراق ، هەردەم هەوڵی ئەوەیان داوە کە چەمکی ئاشتی خوازانەی گەلەکەمان سەرنەگرێت و دوا جار بە ئاگرو ئاسن و گرتن و هەڵواسین و تۆقاندن وەڵامی داخوازیە ڕەواکانی گەلەکەمانیان داوەتەوەو نەیانهێشتووە دانوستانەکان بگاتە ئامانجی کۆتایی .

پاشان بەردەوام لەهەوڵی سڕینەوەی کلتوورو فەرهەنگ و شێواندنی جوگرافیای سیاسی کوردستانیان داوەو بە جۆرەها چەکی پێشکەوتووی

ردەم و تەکنەلۆژیای سەربازی پەلامارو هێرشی درندانەیان بەرپاکردووە ، دژی گەلی کورد .. دەرئەنجام شەڕو کوشتاریان درێژە پێداوە وە ەکەشمان بۆ تاکە ساتێك سازشی نەکردووە لە بەرامبەر دوژمن و گیانی ەنگاریان و ورەی پۆلاینیان بۆتە بورکانێك و داستانی نەبەردیان تۆمار ەووە .

اوای لێبوردن لە خوێنەران دەکەم بۆ دواکەوتنی بە چاپ گەیاندنی ئەم رتووکەم چونکە هەر لەو سەردەمەوە کە ئەو جوامێرو مێرخاسەی ەوەکەم لە گەڵدابووە نوسیوەتەوە . بەڵام ئەبێ ئەو ڕاستی‌یەش بە ێنەرانی ئازیز بڵێم ، کەبەهۆی ژیانی پێشمەرگایەتی‌وپاشان ناجێگیر ونی خۆم و ڕاکە ڕاکەی خۆم لەدەست دوژمنانی داگیرکەر ، نەپەرژاوم ئەم رتووکە بەچاپ بگەیەنم ئەو کات تاوەکو دەست خوێنەری کوردی بەرێز ەوتایە .

ەرچەندە دواکەوتووە ، بەڵام پێزو سود بەخشی خۆی هەیە و ئەو بۆزیەشی لە دەست نەداوە و و پەرتووکەکەش و بەسەرهاتەکەشی ڕداوێکی واقیعی و خۆڕاگری تاکەکانی نەتەوەکەم نمایش دەکات لە ەرامبەر دوژمن . هەرچەندە دوژمنی گەلەکەمان ڕژێمی بەعسی عەرەبی ەدامی تا ئێستاش هەرماوەو ئەم پەرتووکەش وانەیەکی زیندووە بۆ ەموو مرۆڤێکی کوردی ئازادی خواز و تاوەکو درندایەتی ئەم ڕژێمەیان بۆ اشکرا بێت .

ومێدەوارم بەم کارە سوودم گەیاندبێ و داوای لێبوردنیش دەکەم لەهەر کەم ورتیەك و هەموو ڕەخنەو پێشنیارێك پێش وەخت بە سنگێکی فراوانەوە ەری دەگرم بە سوپاسەوە ، هەر چەندە هیچ شتێکیش بێ کەم و کوڕی نابێت ؟...

ئیتر جارێکی تریش هیوای دوا ڕۆژێکی ڕوناکتر و سەرکەوتنی یەکجارەکی بۆ گەل و نەتەوە هەژارو چەوساوەکەم دەخوازم .

سید قادر جەباری

٦ی ڕەشەمێی ٢٦٩٩ی کوردی

٢٠٠٠/٢/٢٥

خوێنەرانی بەڕێز ..

ئەم هۆنراوەیەلە سەر ڕەفتارە شۆڤێنەکانی رژیمی بەعسە ، رژێمی‌کەچۆن سیاسەتی نامرۆڤانەی(تەعریب وتەبعیس وتەرحیل وتەهجیر) لە دژی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان بەگشتی و ناوی شاری (کەرکوك) شاری گڕوبڵێسەیە بەتایبەتی ، کە بە بەرچاوی حکومەتەکانی جیهانەوە خەریکی ئەوەیە روخساری کوردانەی کەرکوك بگۆڕێ و عەربی تیانیشتەجێ دەکات بەکۆمەل

- خوێنەری ئازیز...

رژێمێك چەند دڕندەبێ ، هەموو توانایەکی خۆی لە ڕووی سەربازی وسیاسی‌وسیاسەتی‌داپڵۆسین گرتبێتەبەر ، بەلأم ڕاستی هەر ڕاستی‌یەو بەخوێن تۆمارکراوە بۆیە لە بەرامبەر ئەوسیاسەتەی دوژمن ڕاشکاوانەپێان دەڵێم :-

کەرکوك بە پایتەختی دێرین ناوی کەرکوکمان تۆمار کردوەلە مێژوودا.

لە سەدەی‌هەژدەهەم دا مەڵبەندی ئەیالەتی(شارەزوور) بووە کە (٣)سێ لیوای تازەی کرکوك وسلێمانی‌وهەولێر دەگرتەوە ، پاشان ناوی (شارەزوور) لە سەنجەقی کەرکوك نراو لیوای کەرکوك خرایە پاڵ ، لە کاتێك دا کە شارەزووری مێژووی (واتە سلێمانی) لەدەرەوەی ئەم سەنجەقە تازەوە بوو ،لەساڵی ١٨٧٩ دا وویلایەتی موصڵ پێکەوە نراو ، کەرکوك هەروەك شارێکی پڕ بایەخی سوپایی مایەوە ..

شان وەك دەڵێن مێژوونوسان كە ویلایەتی موصلی عوسمانی لە(٣)سی
بوا پێك دەهات كە (موصلْ و كەركوك و سلێمانی ) وە لە ساڵی ١٩١٨ دا
٢)سێ قەزای باكوری ڕوباری زێی بچوك لە كەركوك جیاكرانەوە تالیوای
ەولێریان لێ پێك هێنا ، بۆیە جارێكی دی بەو هۆیەوە ئەم ڕوونكردنەوەمان
وون كردەوە تەنها بۆ زانیاری .. تكایە .

ڕوونكرنەوەی نووسەر
لەسەر ئەو پارچە هەڵبستەی
كە بە سەر كەركوك دا نووسراوە
٢٠٠٠ /٢/١

ە سەر ڕەفتارەكانی ڕژێمی بەعسی ڕەگەز پەرست بەرانبەر بە كورد.
مێژووی دیوارە بە خوێن سور هەڵكەڕاوەكانی
زیندان فێریـــــان كـردم !
فێریان كـردم!
كە تاریكی لە ژوورە بێ ئاسمان ڕەتووشەكانی
((هەیئەدا)) بكەمە ماڵ
قامچی و هەڵواسین و زڕەی زنجیر
بكەمە خەوی ژێر سەرینی ڕەقم
تەنیایی و بێ سەرو شوێن بوون
بكەمە ئەلبوومی كەركوكی زێڕی ڕەشم
لە بیرم دێ..
سەیوانەكەم بۆتە وڵاتی شەهیدستان
شەهیدانی بێ گۆڕ
چەندین گۆڕی بێ ناونیشان ..!

ئەو ڕۆژانەی پەتی جەللاد
دەبووە ملوانەکەو
دەکرایە گەردنی ڕۆڵەیەکم
قەڵای کەرکوکم
ڕادەچەنی و
زمانی دەپـــڕا ..
حیکایەتی خۆی دەگێڕایەوە !
لە مێژەوە خوێن لە جەستـەی
کەرکوکم دەچۆڕێ
لە دێرێکەوە
دەیانەوێ ئەم ڕەگەزەم بگۆڕن
ئەم سەروەریە مێژووییەم
بە هەدەر بەرن
سەدان ســاڵـە
کەرکوکی کوڕو بلێسەم
لە ژێر چەپۆکی دوژمن دایە
سەدان ســاڵـە ..
کەرکوکەکەم دەکرێتە عەرەب و
بە بەرچاوی مافی مرۆڤەوە
کریسمسی عەرەب کردنی شاری
بۆ دەگێــڕن .
وەلێ .. کەرکوکم .
پیاوێکی ڕدێن سپی
ئازار چەشتوەو

ربە تەنیا وەکو قەڵا .
ندە پێ ڕادەوەستێ و
ك بورکانی ڕقی پیرۆز
وار ئەکـــا !
ێنێ سەدان ڕۆڵەیان کردم
ارا.
ر پێڕێش بوو
مەی
ەعریب ، تەبعیس ، تەرحیل ، تەهجیر))یان فێرکردم
ندە نەمابوو ڕەگەزم
فێن ..
ری نەمابوو
م مێژووەم
ەدەر بەرن ..
وەی کردیان
وەی لە مێژووی
شستا نەنووسرابوو
وسیان ..
وایان لێکردینە ژەهرو
ەلاّتی سینایدکراین
لاّم هەرگیز مل کەچ نابین
رکوك قەڵای کوردانە
و بلّێسەی هەموو شۆڕشگێڕێکی کوردستانە
ی کەرکوکم

سوێند بە قەڵای بەرزی تۆ
بە شەهیدانی گەرمیانت
بە خوێنی ژووری تاریکی زیندانت
لە گۆڕ نێن
زەبرو زەنگی دوژمنانت
مژدە بدەین بە گشت کوردان
هەر کەرکوکە .. پایتەختی کوردستان .

هۆنراوەی نووسەر

گورزی گورچك بڕ ، تازە مۆغەرەی پشتی بزوتنەوەیەکی کوردی لە عێراق دا شکاند بوو هێشتا ئەندێشەی زامە قوڵەکانی سارێژ نەببوو ، گەلی کورد لە هەر پێنج پارچەی کوردستانی داگیرکراودا خۆڵەمێشی بەسەردا کرابوو ، گڕو گڵپەی شۆڕش خەن کرابوو .
لە ماوەیەکی زۆر کورت و تەنها کورد ئاسا گیانی بەرنگاربوونەوەی بوە مەشخەڵی شۆڕشێکی نوێ ، بڵێسەی شۆڕشیش تا دەهات زیاتر لە جۆشدانیدا وەك گیانێکی نوێ بکرێتەوە جەستەی گەلی کوردمان . ئەوانەی کە جۆشدانی خەباتیان هەڵبژارد شانیان دایەبەر ئەو دارە شکستەی شۆڕش ، ئەم جۆش و خرۆشە شۆڕشگێڕییە لە گەڵ خۆیدا سەدایەکی گەورەی هێنایەوە نێو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردستان و ورزەو تین و تەوژمی زیاتری دابەو کەسانەی هێشتا کارەساتی ئەو دەمەی شۆڕش ساردی کردبوونەوە ، بەلام ئەو دەنگە کوردانەیە هەموو پەناو پاسارو کوچەوبازارێکی کوردی گرتەوە ..

دەنگی دلێری شێرە کوڕانی (کوردپەروەران) ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە تاوداندا بوون .

چ لە دەرەوەی کوردستان و چ لە ناوەوە بزوێنەری هەڵایسانی شۆڕشێکی نوێ لەسەر تەرزێکی سیاسی سەردەم شۆڕشگێڕانی هاندا کە بڕیاری خۆیان بدەن .

بەڵام پشتیوان بە هێزی لەبن نەهاتووی گەلی کورد ، بەڵێ تەنها خۆی ڕێگای خەباتێکی دژوار هەڵبژێری ، خەباتێکی درێژ خایەن ، بەڵام ژیرانە بە ئەنجامی بگەیەنن . گرتنە بەری ئەو ڕێگە هات و نەهاتەی شۆڕشی کوردان لە پێناوی دەستەبەر کردنی مافە ڕەواکانی نەتەوەیەکی بن دەستی کورد بوو وە هەر واساناو ساکار نەبوو بڕیاردان لە بارەی هەڵگیرسانی شۆڕشەوە بەڵکو ئەو مێرخاسانەی گەلەکەمان گرەویان لە سەر مەرگی خۆیان دەکرد(یاسەرکەوتن یا نەمان)یان کردبوژە دورشمی شێلگیرانەی شۆڕشگێڕییان . وە ژیان بەو مانایە دەهات بە هەموو لایەنە ماددی و مەعنەوییەوە لە خزمەت پرینسپی شۆڕشێگڕانەی کوردان بوو بۆ خزمەتی زیاتر بە شۆڕش ، ناو زەندو شێنێ بووە مەڵبەندی کۆکردنەوەی پارتیزانەکانی شۆڕشی نوێ .پەیتا پەیتا جەماوەری گەلی کوردی لە ئامێزدەگرت ، ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانیش بە ڕۆڵی داگیرکەرانەی خۆیان ، هەمیشە و بەردەوام لە پیلان و نەخشەی دوژمنکارانەی خۆیان دا بوون بۆ نەهێشتنی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشێکی نوێ ، دوژمنانی گەلی کورد ، ئەو کات بە هەموو توانایەکی سەربازی و سیاسی و بە کارهێنانی کاری سیخوڕی لە پیلان دابوون بۆ دەستەمۆکردنی خەڵکی کوردستان لە ڕێگای کاری دڕندانەیان و بە کارهێنانی تۆقاندنی جەماوەری گەلەکەمان لە ڕێگای دەزگا داپلۆسێنەرەکانی‌یەوە تاوەکو هیچ بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی لە

کوردستان دا سەرهەڵ نەدات و بە هەموو شێوەوشێوازێکی دوور لە بەها مرۆڤایەتیەکان کردەوەی وەحشی گەرییان ئەنجام ئەدا .
لەم پێوەندانگەش دا ، ڕۆڵەکانی کورد و سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی ئەم گەلە چەوساوەو بن دەستە ، بە میتۆدێکی نوێ و بە خاراو کردنی فکرو هۆشی شۆڕشگێڕیان هاتنە نێو گۆڕەپانی خەبات و ڕۆڵەکانی گەلەکەمانیان بە شێوەیەکی زانستی جۆش دابوو بە شێوەی ڕێکخستنی پۆلاینەوەو بە دیسپلینێکی پڕ لە بڕواوەهەوڵی خۆڕێکخستنەوە یان دەدا لە هەمان کاتیش دا بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی شۆڕشی نوێ هەمیشەو بێسڵەمینەوە لە دوژمن بڕوایەکی نەگۆڕیان هەبوو بە پرۆسەی ئاشتی وە پێکەوە ژیانی سیاسیانەی سەردەم کە خزمەت بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد بکات .
لە تێکۆشانی بەردەوامی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان و لە نێو بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی لە شۆڕشی نوێدا ، هەمیشەو بەردەوام کۆششیان بۆ پراکتیزەکردنی ئاشتی کردبۆوە بەردەبازی سەرکەوتنی یەکجارەکی ، سەرکەوتنێک کە مافە ڕەواکانی کوردی تیا بەرجەستەکرابێ ، بۆ فەراهەم کردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و وێرای بڕوابوونیان بەچەمکەکانی مافی مرۆڤ و پرۆسەی ئاشتی ، بەلام بە پێچەوانەوە ڕژێمی داگیرکەری بەعس ، بە ئاراستەیەکی سەلبی‌یدا دڕندانەترین شێوەی بە کارهێنا بۆ سڕینەوەی نەتەوەی کوردی ئاشتی خواز . ڕژێمی داگیرکەری بەعس سادەترین ماف چی‌یە هیچ کات و ساتێك نەك هەر بەرەوای نەزانیوە بۆ گەلی کورد ، بەڵکو دڕندانەترین شێوازی ئەشکەنجەدانی گرتبووە بەر ، بەردەوامیش بە بیری نەژۆکی یان عەرەبیزمی بەعسی کەوتنە هێرش و فشار خستنە سەر خەڵکی بێ تاوانی کوردو گرتنەبەری سیاسەتی ڕاوەدوونان و بەند کردن و ئەشکەنجەی نامرۆڤانە و کوشتن و لە سێدارەدانی ڕۆڵەکانی کوردی کردبووە بەرنامەی ڕۆژانەی . تەنهابە تۆمەتی ئەوەی کە کوردن و

چ شێوازێکی ئەشکەنجەدان ئەما لە سایەی ڕژێمی بەعسەوە پیادەی
ئات بۆ سەر خەڵکی بەش مەینەتی کورد .
تایی سایەستی شۆڤێنستی بەعس لەوە دەرچوو بوو کە ئەو بەندکراوانە
ڕیزەکانی شۆڕش و خەبات و تێکۆشان دا ڕێگای سەربەرزیان بۆ خۆیان و
ەوەکەمان تۆمار دەکرد ، بەڵام ڕژێمێك هێندە سیاسەتی لەسەر تۆقاندن و
تن و بێ سەرو شوێن کردنی ڕۆڵەکانی گەلی کورد کردبووە تاکە شێوازێکی
ژمنکارانە دژ بە گەلی کوردمان تێکرا ، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە بەڵگە
یستەش ، ڕژێمی بەعسی عێراق هەر بە ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی
لەکەمانەوە سیاسەتی تۆقاندن و گرتنی بە کار نەدەهێنا ، بەڵکو هەڕەشەی
کەسانی کاسبکار دەکرد کە خەریکی بژێوی ژیان بوون و سەریان کز
دبوو لە ژێر باری نائارامی ئەم ڕژێمە داگیرکەرو خوێن مژەی کورد .
ێمێك هێندە دڕندە بێ کە کەسانی کاسبکاریشی بگرتایە بە هەمان شێوەو
ستوور بەر هێرشی قەڵاچۆکردنی نەتەوەیی دەبوونەوە ، لە چوار چێوەی
و نەخشە گڵاوەی کە ڕژێمی دڕندەی بەعسی فاشی دژ بە مرۆڤایەتی
یڕشتبوو بۆ لە ناوبردنی یەکجارەکی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عێرا

ێن ئەئەم ڕژێمە لە بەرنامەی شۆڤێنیانەیدا جوگرافیای سیاسی عێراقی بە
رەب لە قەڵەم دابوو ، هەر گەل و نەتەوەو .کەمینە نەتەوەیەکی تر دەبوو یا
ۆك دابدات یا لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەیەکی نامرۆڤانەی لە خزمەت بەعسی
ربی صدامی) خوێن مژدا بێت ..
ەم جۆرە سیاسەتە چەپڵەی دوژمنی بەعسی صدامی لە مێژووی گەلانی
یهاندا کەم وێنە بووە کە تارەکو هەنوکەش کار بەو پیلانە ژەهراویەی خۆی
تاقمەکەی دەکات .

شۆڕشی نوێ .. کە بەبیری نوێخوازی و لەسەر بنەمایەکی نیشتمانی و ڕزگارکردنی کوردستان لە ژێر چەپۆکی ، ژەهراوی بەعس بووە فاکتەرێکی پۆزەتیڤانە .. تاوەکو شۆڕشی نوێ بە پرینسپێکی نیشتمانی و بە بڕوایەکی نەگۆڕەوە پاش ئاشبەتاڵ کردنی شۆڕش بە شۆڕشگێڕانی ئەو دەمەی کورد بە ماوەیەکی زۆر کورت ، لە چەند مانگێك دا جارێ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی ئازادی خوازانی کوردی بە جیهان ناساند و دوژمنانی پێ شپرزە کرد لە دوای ئەو نسکۆیەی شۆڕش ، شۆڕشی نوێخوازی خەڵکی کوردستان لەسەر بەرنامەو بنەمایەکی شۆڕشگێڕانە و پشت ئەستوور بە هێزی لە بن نەهاتووی جەماوەری چەوساوەو زوڵم لێکراوی کورد ، بە شێوەیەکی زیرەکانە توانی دەست بە ڕێکخستنەوەی خۆی بکات چ لە چیاسەرکەشەکانی کوردستان بێ یا لە ناو شارو شارۆچکەکانیش دا درێژە بە ڕێکخستنی نهێنی خۆی بدات و بەو پەڕی وورياییەوە ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شار بەرنامەی کارو چالاکی شۆڕشگێڕانە داڕێژن وبەم شێوەیەش دوژمنی بەعس هیچ شێوازێك نەما نەیگرێتەبەر بۆ ئاشکرا کردنی ڕێکخستنەکانی شۆڕشی نوێ ، بەڵام ئاکامەکەی بێ سوود بوو کە ڕژێم بە سانایی بتوانێ لە ڕێگای سیخوڕەکانییەوە تالە داوێکی ڕێکخستن بزانێ ..

ڕژێمێك بەو هەمو توانامادی معنوی و سیخوڕەکانی لە بۆسەدا بوون کە شۆڕشگێڕێ ئاشکرا بکرێ و دواجار تەواوی ڕێکخستنە نهێنی یەکانیش ئاشکرا ببێ ، لە م قۆناغەدا هەمو هەوڵ و پیلانی دوژمنکارانەی ئەم ڕژێمە تەرخان کرابوو بۆ ئەوەی چنگی گڵاوی لە یەکێك لە ڕێکخستنەکانی شۆڕشی نوێ گیر بکات .

بەڵێ ڕژێمی داگیر کەری بەعس ، هەمیشە بە دوای بچوکترین جووڵەی شۆڕشگێڕانی کوردان دا دەگەڕا لە ڕێگای دەزاگا سیخوڕیەکانیەوە .

شۆڕشی نوێخوازی گەلی کوردستان لە (عێراقی بەعسی صەدامی‌دا) بە بیری خاراوی شۆڕشگێڕانەو لەسەر دیسپلینێکی ڕێکخستنی پۆلاین بەلام بە بیر و بازووی کەسانی لە خۆ بردوو هێندەی پێ نەچووە ،پاش ئاش بەتالکردنی شۆڕشی ئەو دەمەی ئەیلول بە دۆست و دوژمنیان سەلماند هەر کاروانێ بەرەو ئاسۆی ئازادی بڕوانێ ، کەم بێ یا زۆر دەگەنە خۆر ، ئەم میتۆدە شۆڕشگێڕانەیان پراکتیزە کرد لە نێو چین و توێژە نیشتمان پەروەرەکانی گەلەکەمان ، بە ماوەیەکی زۆر کورت ، شۆڕشگێڕانی خەباتی نوێخوازانەی گەلەکەمان توانیان بە بڕوابوون و گیان بازی پارتیزانە سەرەتایی‌یەکانی شەقامی سیاسی کورد لە ناوەوە و دەرەوە بسەلمێنێ ، کە کورد نەتەوەیەکی چەوساوەو بێ دەستەو هەمیشە بە درێژایی ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق ، سادەترین مافی ئەم گەلە سەربلندەیان نەك هەر نەداوە ، بەلکو ڕژێمی بەعسی دڕندەی صەدام هەمیشە بەردەوام بۆ فرسەتێك گەڕاوە کە ناوی ئەم نەتەوەچەوساوەیە لەسەر نەخشەی جوگرافیایی سیاسی کوردستانیش بسڕێتەوەو ئەو ناوچە و شوێنە ستراتیژیانەی کورد بە عەرەب پڕ بکاتەوەو تاوەکو بۆ ماوەیەکی کەم تازۆر ئەو شارانە بکاتە شاری عەرەبەکانی خۆی ، ئەم سیاسەتە شۆڤێنستیانە ڕژێمی بەعس ، لە هیچ فەرهەنگێکی نەتەوە چەوسێنەرەکانی‌دا ئەو جۆرە مامەڵەیەی لە گەڵدا نەکراوە .. ئەم سیاسەتەشی دەگەڕێتەوە بۆ دوو فاکتەری سەرەکی :ـ

یەکەمیان/ ئەو شوێنە ستراتیژیانەی کە بەرەسەنایەتی بۆ کوردستان بووەو بەلام لە ڕووی بواری ئابووری‌یەوە ئەم ڕژێمە مەبەستی گلاوی خۆی لەمەدا بەر جەستەکردووەکە ناوچە پترۆلیەکان کە تائێستاش بەدەست ڕژێمەوەیە بە هەموو شێوازێك نەهێلێ کورد لە کوردستانی زێدی باب و باپیرانی خۆی بەکار نەهێنێت ، هەلبەتە بنەمای ئابووری کوردستان پاش داگیرکردنی ، بە هەموو شێوازێکی شۆڤێنستانە هیچ کات سەردەمێك بۆ کوردی بە ڕەوا

نەبینیوە ، بەلام بۆ ڕژێم و دەستەو تاقمەکەی خۆی بە تالان بۆ خۆیان بردووە پاشان بە هەموو شێوازێکی دوور لە مرۆڤایەتی چەکی پترۆلی کوردانی بۆ چەك و تۆپ و داگیرکردنی سوپا بەزیوەکەی بە کار هێناوە ، هەرچەندە بە شێوازێکی نهێنی و دەوڵەتە زلهێزەکانەوە نوێترین شێوازی دایلۆسینیان فێری پیاوانی ڕژێم و سەرانی ئەو ڕژێمە کردووە تاوەکو ڕژێم بە هەموو توانایەکی‌یەوە ، دژ بە بزوتنەوەی خەباتی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان بوەستێ و بە تالان خێرو سامانی سروشتی نەتەوەیەك بدزێ و کەسیش بەبێ ئەوەی دەست وەرداتە کارو باری ئەم ڕژێمەو دەستەو تاقمە خوێن مژەکەی .

بۆ ئەو مەبەستە گلاوەشی ، شێواندنی ڕەگەز و زمان و کلتور و فەرهەنگ و باری سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری کوردستان بووە ، ئامانجیش لەو سیاسەتەی بە دوای بچوکترین جولانەوەیەکی ڕزگاری خوازی گەلەکەمان دا ، هەموو توانایەکی دژە مرۆیەکانی خۆی خستوەتە گەڕ لە ڕێگای دەزگا سیخوڕەکانی‌یەوە . کە بچوکترین بواریشیان بۆ کورد نەهێشتوەو نایهێڵنەوە ؟.

-لەم ڕوەوە ڕۆڵە بە وەفاو گیان لەسەر دەستەکانی کورد لە شۆڕشی نوێ دا ، زیاتر و زیاتر لە پیلانە گلاوەکانی ڕژێم ، بە ئیرادەی خوێنان و پشت ئەستوور بە جاماوەری گەلەکەمان کە چاوڕگی لە بن نەهاتوون ، خەبات وتێکۆشانیان بەرامبەر دڕندەترین ڕژێم و بە بەتواناترین سوپا لە بواری لۆجیستی و توانای سەربازی لە ڕادە بەدەر وەستانەوەو جاڕی شۆڕشی نوێیان داوە ، ئەو کات (کوردستان یان نەمانیان) کردبووە دروشمی‌ئەو ڕێگا پیرۆزەی شۆڕش و جۆشدانی خەبات و گیان بازی . هەرچەندە ڕژێم ئەوەی لە توانایدا بوو درێغی نەکرد بەرامبەر ڕۆڵەکانی گەلەکەمان کە بە سەدان مرۆڤی خۆ نەویست خێزانە نێو زیندانی فاشی‌یەکانی‌عێراق و بە دەیان سەرکردەو

ادرو تێکۆشەر بوێرانە پەتی سێدارەیان بە دەستی خۆیان کردە گەردنیان ،
ـەنیا بـە خـاتری ئـەوەی دوژمنـــی بەعســی صـــەدامی نـــەتوانن تەنــها
وشەیەکیان پێ بدرکێنن ، ئەم وورە پۆلاینەی لە لای زۆربەی شۆڕشگێڕانەی
ورد ، کەهەموو شێوازێکی ئەشکەنجەدان و سێدارەیان زۆر لا ئاسایی بوو
چونکە وەك شاعری نیشتمان پەروەری بێ کەس دەڵێ
اری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ
سەربەخۆیی و بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ
هەروەهاش هێمن دەڵێ بەرامبەر ئەوانەی ناپاکی دەکەن دژ بە گەلەکەیان بەم
شێوەیە پێیان دەڵێ :-
نۆکەری و سەردانەواندن ، کاری نامەردانەیە
ئەم دروشمە شۆڕشگێڕی و نیشتمان پەروەرییە ، لە مێژ بوو لەلای خەبات
گێڕانی گەل کورد ببووە ڕاستییەکی بەڵگە نەویست هەر بۆیە لەلای زۆربەی
زۆری دڵسۆزانی گەلەکەم ، ئەشکەنجەدانی فاشییەکانی بەغدا ، وانەی نوێی
زیاتریان فێر دەبوو . وەهەر کەسێك کە باسی شێوەی ڕەوشت و دڕندانەیەی
ئەو ڕژێمەو دەست و پێوەندەکانی بگێڕێتەوە .
لە چۆنێتی ئەشکەنجەدان و بەند کردنی هەر کەسێکی کورد کە ئەو ڕژێمە
دەخوازێت دیارە بەبێ هیچ تاوان بارێەکی ئەوکەسە لە داداگایی بێ دادی
ئەو ڕژێمەوە بە پێچەوانەشەوە بۆ کەسێکی بێگانەو بێ ئاگا لەو دەڤەرە
خۆشەویستەی کوردان لەوانەیە بە گێڕانی یان تاوەکو باوەڕ پەیدا دەکات
بەو دڕندەییەی کە ئەو ڕژێمە بەکارە دهێنێ و هەیە ، ئەو کات بڕوا بە
شۆڤێنستی ئەم ڕژێمەی عێراق بکات ، چونکە هیچ دەوڵەتێك یا لایەنێکی
سیاسی لە دەرەوەی کوردستان باوەڕ ناکات کەمرۆڤ هەبێ بەو شێوە
دڕندایەتی و نامرۆڤانە ڕەفتار لەگەڵ مرۆڤ ، ئافرەت گەلێکی چەرساوەی
وەك کورد دەیکات ، کە بڕوا ناکات کە حوکم ڕانێکی بە زۆر سەپێنراو بەسەر

گەلانی عێراقدا ، ڕادەی دڕندایەتی و نامرۆڤانەی لە گەڵ مرۆڤێکی تردا بکات وەك ئەو ڕژێمانەی داگیر کـەری کوردسـتانن ، بـە تایبـەتی ڕژێمـی بەعسـی صەدامی دەزگای تۆقێنەرو ئەشکەنجەدانی دژ بەگەلی کورد دەیکەن .
پێویستە ئەوەش بوترێ ((کە هـەردەم دوژمنـان و داگیرکـەرانی کوردسـتان شـەڕیان سـەپاندووە ، بەسـەر گـەلی کـوردا ، وە هیـچ کـات لـە مێـژووی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستاندا ، کورد وەك گـەلێکی دێریـن لـە خاك و ئاوی باو باپیرانی خۆیدا لەسەر ئەم خاکـە ژیـاوەو شـەڕی بەکـەس نەفرۆشتووە لە هیچ سەردەمێکدا وە هەمیشە خوازیاری ئەوەبێ لـە ڕێگـای ئاشـتی و دیموکراتـیزەکردن و بەدەسـت هێنـانی مافـە ڕەواکـانی خـۆی وە دەست بهێنێ ، هەر کورد ئاشتی خـواز بـووە وەك لـە سـاڵی ١٩٧٧دا کەسـەر بەرێکخسـتنەکانی لایـەن و گروپـە سیاسـی‌یەکانی کوردسـتان بـوون ، لـە تەواوی شارو شارۆچکەو گوند و ناوچە جیاجیاکانی باشووری کوردستان هەر لەدوای (هـەرەس) کەوتنـەوە خۆ ڕێکخستن و کاری ڕێکخراوەی خۆیـان ئەنجام دەدا وەك کار دانەوەیـەکی شۆڕشـگێڕانە دژ بـە ڕژێمـی بـەعس و دام دەزگا سەرکوت کەرەکانی‌یەوە ، هەڤاڵێکی سەر بە ڕێکخستنەکانمان لـە نێو جەرگـەی شـاری کـەرکوك شـاری گـڕو بڵێسـسـەدا کـە (پایتـەختی هـەرێمی شارەزووری لە باشووری کوردسـتان ، بـە پێـی بۆچونـەکانی (دکتـۆر جمـال ڕەشـید) کـە چـەند لێکۆڵینەوەیـەکی زمانـەوانی دەربـڕی و شـیکردبۆوە دەربارەی وولاتی کوردان هەڤاڵێکە دڵسۆزو چەلەنگ کە کرێکاری شەریەکەی نەوتی کەرکوك بوو لە گەڵ چەند هەڤاڵێکی تری‌دا لـە شـانەیەکدان ، کـاری ڕێکخراوەیـان ئـەنجام دەدا ، کە ئـەم هەڤاڵـە بـە نازنـاوی نـهێنی (مەحەمـەد موراد) کـاری ڕێکخستنی دەکردوو خاوەنی خـێزان و دوو منـاڵی ژیکەڵـەی چاو گەشی هەبوو ، لە پێنـاوی بژێـوی ژیـان بۆ خێزانەکەی و خـۆی و پـەیدا دەکرد ، چونکەکەم دەست و بێ دەرامەت بوو لە خانووی باوکی دا ژیانی

هەرچۆنێ بێ دەگوزران ، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم)ی شاری کەرکوکدا دەژیا ، لەگەڵ ئەو ژیانە سەخت و گرانەشی دا هەمیشە خەونی بە ڕۆژگارێك دەبینی کە ئەمیش وەك ڕۆڵەیەکی نەتەوەکەی ، خاوەنی گیانی سیاسی بێت و تا دەهات ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بیری کورد پەروەرانەی پانتایی مێشك و هەستی شۆڕشگێڕانەی برەوی دەداو ئازاد کردنی نەتەوەکەی ئەو خەمە گەورەیە بوو کە هەمیشە لە مزری خۆیدا بیری لێ دەکردەوە پانتایی مێشکی گرتبۆوە .. هەردەم هەموو ئامانجێکی ئەوڵ و کە خوازیاری ڕۆژی ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستانە زام دارەکەی بوو ، بۆیە بۆ تەنیا ساتێك چییە و ورەی شۆڕشگێڕانەی مەکۆم تر دەبوو بیرو هەست و ویژدانی بەوە ئاسوودە دەبوو کە درێژەی بە کاری نهێنی ڕێکخراوەیی دەداو ئەوەی پێی بوترێ چۆك دادان ، سستی و خاوبونەوەو بێزاری لە ڕوخساری گەشی ئەم مێرخاسەی کوردا بە دی نەدەکرا ، تەنانەت لە ناخۆشترین کات و سات دا جۆش دانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی بە جۆش تر دەبوو . بە هۆی ئەوکەمە خوێندنەی کە لە خوێندنگا خوێندبووی بە باشی دەیتوانی بەسەر هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دا بە نووسین و خوێندەوە زاڵ ببێت و کەمێکیش لە زمانی ئینگلیزی بە هۆی کارەکەیەوە دەزانی ، بە هۆی وریای و ماندووبوونی خۆ بسەلمێنێ و لە کاری ڕێکخستن و لەگەڵ بواری ڕۆشنبیری نێو ریزەکانی ڕێکخستن دا زوو پێش بکەوێ و بوو بە بەرپرسی شانەکەی خۆیان ؟

لە چوارچێوەی کاری ڕێکخستن داوبۆ کاری ڕێکخراوەی پێشتر ئاگادار کرابوو کە کۆبوونەوەی هەیە لە بەرواری ١٩٧٧/٦/٢٠ لە بناری چیای سەرکەشی (سورێن) ، بۆیە دەبوو لەو کاتەی بۆی دیاری کرابوو لەوێ ئامادە بێ ؟!

کردارێکی چاوەڕوان نەکراو بووە ، هەڤاڵی ناوبراومان ئامادە نەبوو ، ئەو کارە هەرگیز لەو نەدەوەشایەوە ، چونکە ئەو کەسایەتی‌یە بە هێزو خاوەن

دیسپلین و بەرپرس بوو بەرامبەر نەتەوەکەی ، چوون دەیزانی نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی ماف زەوت کراوەو دوژمنەکانی هەمیشە لە پیلانی داگیر کەرانەی خۆیان نەکەوتون ، تەنها لە پێناوی دەست بەسەرا گرتنی سەروەتی نیشتمانی کوردستان کە ژێر خاکەکەی بە نرخترین کانزایی تێدایە .
ئەم هەڤاڵەمان بەو میتۆدە بیری دەکردەوە کە کوردایەتی پێویستە لەسەرو هەموو خواستەکانی ترمانەوە بێت بۆیە دواکەوتنی ئێمەی خستە دڵە ڕاوکێ و کەوتینە بیرکردنەوەیەکی تراژیدیا ئاساو خەم و پەژارە دایگرتین هەر لەچاوەڕوانی دا بووین ، بوو بە دوو ڕۆژ ، سێ ڕۆژ هەر ئامادە نەبوو کەوتینە سۆراخ کردنی بە نهێنی نەمان دەزانی لە چ شوێنێکە ، بۆیە ئیتر نائومێد بووین لە هاتنی و زۆر بە پەلە هەواڵمان نارد تاوەکو بزانین چی ڕووی داوەو هۆی دواکەوتنی ئەو هەڤاڵەمان بزانین ؟!
دواتر هەواڵ گەیشتەوە ، کارەساتێکی ناخۆش و دڵ گوشێنەرمان بیست ، هەست وهۆشمان لە ساتێك دا هەزارو یەك سەرە داوی دەهێنا و دەبرد (وەك کورد وتەنی) :- ((ئەرز قووتی دابێ)) دەبێ چی لێ بکەن ؟! چۆن ئەشکەنجەی دەدەن ،((هەرچەندە خوانەخواستە هەرچەندە لە دڵسۆزی بەتواناشی دڵنیاین ، بەڵام ئەوە ڕژێمی بەعسەو جۆرەها شێوازی ئەشکەنجەدانی هەیە بۆ نهێنی درکاندن)) لە دڵی خۆمان دا ئەمان گووت (گوێی شەیتان کەڕ بێت نهێنی‌یەکان نەدرکێنێت) ؟!
بۆ پاراستنی گیانی هەڤاڵانی ترمان و ڕێکخستنەکانمان ، کەوتینە گۆڕینی شێوازی کاری نهێنی و شوێن وون کردنی ئەو خەتە ڕێکخستنەی لە ناو شاردا کاری دەکرد بە تایبەت خەتی شانەو شانەکانی تری ڕێکخستنیش لە کەرکوك زیاتر بە ووریایی کارکردن ، لە پێناوی پاراستنی ژیانی هەڤاڵانمان و لەدەست نەدانی ئەو خەتانەشمان .. ئەم کێشمە کێش و دڵە ڕاوکێ‌یەو بارە

ناهەموارو نالەبارە درێژەی کێشا ، تاوەکو ۱۹۷۷/۷/۱۸ ، هەواڵی ئازاد
وونیمان پێگەیشت و بە تەواوی دڵنیا بووین .
ە بەرواری ۱۹۷۷/۷/۲۷دا ئەم ڕۆڵە قارەمانە خۆی ئامادە کردبولامان ، پاش
حەوانەوە و ماندوو دەرچوونی .. لە سەرخۆو بەهێمنی چۆنێتی کارەساتی
زینداني کردنی بۆ گێڕاینەوە تاکاتی ئازاد کردنی .؟!
ەم شێوەیە ئەم قارەمانەی کورد و کوردستان سەرگوزشتەی خۆی گێڕایەوە
ۆمان !
(پاش گەڕاندنەوەم لە کار ..هاتمەوە بۆ ماڵەوە ، وەك هەموو ڕۆژانی تر کات
ەمەو ئێوارەیەکی خۆر ئاوا بوون بوو ، وەك بڵێی خۆر ئیدی بۆ دواجار وون
بێ لە چاوانم ڕەنگی سووری خوێنینی پێوە بێ . ئەو کات هێشتا لە ماڵ
انی ئێوارەمان نەخواردبوو ، زەمبەلەکی کات ژمێری دیوارەکەمان دەنگی لە
گوێکانمان بوو ترپەی دڵم تا دەهات زیاتر دەبوو ، خۆشم نەم دەزانی بۆ ئەم
ئێوارەیە باری دەروونیم تێك چووە .. لەم بارە دەرونیەدا بووم ، لە دەرگا
ـراو لێ دانی دەرگاکەش ئاسایی نەبوو ، بۆیە بەرەو ڕووی دەرگای
ماڵەوەچووم و پرسیم فەرموو ئێوەکێن ، ئەوانیش ناوی منیان دەزانی ووتی
کاك مەحەمەد خۆمانین ، منیش پێم ووتن فەرموون .
*ئەوان ووتیان هەندێ کارمان پێتەو لە بنکەی پۆلیسەوە داوات دەکەن و
هەر ئێستا دەتهێنینەوە .
-ووتم باشە باخۆم بگۆڕم و جل و بەرگی کە لەبەر بکەم .
*ووتیان نا پێویست ناکات !
-تەنانەت پێڵاوەکانیشم لە پێ نەکردو هەر بە پاپوچەوە بەسەر پێیەوە
(سی) کەس دەبوون کە منیان برد ، پاش ماوەیەك ڕۆشتن ووتم ئەمە ڕێگەی
بنکەی پۆلیس نی یە ..بۆ کوێ من دەبەن ؟!

*ووتیان بێ دەنگ بە ، پاشان چاویان بەستمەوە !! ئەو کات تێ گەیشتم کە بۆ بنکەی پۆلیسم نابەن و ئەمانەش سەر بەو بنکەی پۆلیسە نین ؟ کاتێك کە چاویان کردمەوە .. چی ببینم ، ژوورێك بوو ڕازاوەو دوو کەسی خوێن تاڵی ئەسمەری وورگن دانیشتبوون بە چاویان دا دەمزانی کە کەسانی کاسە لێس و ناحەز بوون . پاش چەند ساتێك ئەوەی لە پشتی مێزەکەوە دانیشتبوو پێی ووتم ناوی سیانیت ، تەمەنت ، شوێنی دانیشتنت ، کارت ، باری خێزانیت ... هتد

–منیش وەڵامم دانەوە بە پێی پرسیارەکانی خۆیان ...؟!

بۆ دووسێ خولەك کابرا بێ دەنگ بوو، منیش بەهەلمزانی و پرسیارم لێ کرد بەڕێز من بانگ کراوم بۆ ئێرە ؟

ئەویش هەر سەری هەڵبڕی و وەك باوکیم کوشتبێ ، چاوی بڕییە چاوم و مۆڕەیەکی زۆر ناخۆشی لێ کردم ، کەوتە کۆمەڵێ ڕستەی ناشرین و نەبیستراو ، ووتی چۆن نازانی بۆ گیراوی ئەی قوڕم ساغ ؟! مەگەر لە بیر خۆتی بەریتەوە کە خەریکی کار پارتایەتیت و دەتانەوێ عێراقی خۆشەویستمان لێ تێك بدەن و ئاژاوە بنێنەوە ...؟!

منیش بەسەر سوڕمانێکەوە هەندێکی زۆر بەناڕەحەتێکەوە ووتم : بەڕێز .. دیارە ئێوە بە دوای یەکێکی تردا دەگەڕێن و منتان بە هەڵە هێنابێ ، چونکە من هەرگیز کاری پارتایەتیم نەکردووەو ناشزانم و کاری لەو جۆرەش ناکەم ، کابرا هەر وەك بڵێی گوێزی بۆ ئەژمێرم ،، وورتەی لە خۆی بڕیبوو ، بە دەستێکی یاری بە دارەکەی دەستی دەکرد .. ووتم : بەڵێ بە ڕێز من کابرایەکی هەژارم و خەریکی بە خێوکردنی ماڵ و منداڵی خۆمم ... هەر ئەوەندەی کەووتم بەس بوو ، لە پشتی مێزەکەیەوە وەك شێت هەستایە سەر پێی و چاوی گڕیلێ دەباری و بە دەمیش بە قسەی ناشرین و نابەجێ بە

ڕووما هەڵ شاخا و دوای تەواوکردنی جنێوەکانی دەستی بۆ یەکێ درێژکردوو ووتی :-

(ئەم سەگبابە بەرن کەی خۆی ناسیەوە بیهێننەوە ) .. جەللادەکانیش ووتیان فەرمانی بەڕێزتانە . بۆیە هەر دوو چاویان بەستمەوەو هێنامیانە دەرەوە لە ژوورەکە ، ئیتر هەر ئەوەندەم خۆش بوو کە هاتمەدەرەوە ، ئیتر نەم زانی ڕۆژە .. شەوە کوێیە و کوێ نی‌یە و چی ڕوو دەدات ، پاش ماوەیەکی زۆر بەدەم ئازارەوە، توومەزە هۆشم هاتوەتەوە بەر .. هەستم دەکرد کە ژێرم ئاوەو کە چاوم هەڵهێنا دیتم تاریکە ئەو جێگایەو چاو چاو نابینێ .. پاش ماوەیەکی کەم ، دیسانەوە هاتنە سەرم و بانگیان کردم بەگرانی‌یەکی زۆرەوە وەڵامم بۆ درایەوە ؟!..

لەبەر شپرزەی دەستیان کردمەوە ، وویستم دانەوێم لە پڕ دوو تەنەکە ئاوی گەرمی لە کوڵیان کرد بە سەرم دا ، کاتێ هاتمەوە هۆشی خۆم .. هەرچی لاشەم هەبوو هاواری دەکرد و وام دەزانی هەمووی لەیەك داڕژەندراوە ..؟!

نەم دەزانی چ کاتێکە .. شەوە ! یان ڕۆژە ، بۆ سبەینێ هاتنەوە سەوم ، یەك سەموونی ڕەقیان بۆ هێنام !؟ بە شێوازێکی زۆر دڕندانەو بە دەنگێکی ناقۆڵا پێیان ووتم ئەوە نانەکەتە قوزەڵە قورتی کە ...؟!

منیش پێم ووتن : ناتوانم بیخۆم .. ، وام دەزانی لاشەم پێوەنەماوە واتە هیچ هیچم نەخواردو نەم دەزانی بۆچی وام بەسەرهاتووە ..؟

لە کوێم ؟..هەروەك خەونێکی ناخۆش دەهاتە بەرچاوم و زۆر جار کە دەخەوتم حەزم دەکرد ، یەکسەر خەبەرم بێتەوە لەو خەونە ناخۆشەو دەرپەڕم بۆناوبازاڕ ، بەڵام خەونی‌چی ، خەونێکی دوژمنکارانە بوو دەرهەق بە سەدان وهەزارانی وەك من بوو بونە مۆتەکەی سەر دڵ و جەستەمان .

لەبەرئەوەی ژوورەکە هێندە تاریك بوو تەنانەت دەستی خۆشم نەدەبینی مەگەر دەستم بدایە لە دەست و دەم و چاو تەواوی جەستەم ...

له پڕ بەدەنگی زۆر بەرز بانگی کردم و بە شێوازێکی دڕندانە پێی ووتم وەرە دەرەوە ، منیش ئەم توانی هەستمە سەرپێ ، هاتن چاویان بەستمەوەو بردمیان ؟ کاتێك چاوم کرایەوە لە ژوورێك دا ئەو کات زانیم کەشەوە .. دوو سێ کەس لە جەللادەکانی ڕژێم دانیشتبوون لێیان پرسیم : (ڕاستمان پێ بڵێ بزانین هەندێك پرسیاردەکەین !! ئەوە نەبێ ئێمە نەزانین لە چ پارتێك دا کار دەکەین ؟!) زۆر باش دەزانین و هاوڕێکانی خۆت کە کاری ڕێکخراویت لەگەڵ دەکەن .. ڕوو بەڕووتان دەکەینەوە ..؟! دواتر لە دوای ئەم پرەسیارانە گەر ڕاستمان لەگەڵ دا نەکەی ئەوا جەستەت دەکەینە قیمە کێشی سەگەکانمان حەز دەکەین خۆت باسی بکەیت بۆمان ؟! و ناوی هەندێك لەو هاوڕێیانەت کە لە گەڵتا کار دەکەن پێمان بڵێی !؟ گەر ڕاستت کرد ئەوا ئازاد دەکرێیت و دەچیتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆت ...!

منیش پێم ووتن ((وەڵاهی من پیاوێکی هەژارم و بەدبەختم ، هەر چەندەکەم ناتوانم بژێوی ماڵ و خێزانەکەم دابین بکەم ، وەڵاهی من ئەو کەسەنیم کە ئێوە بە دوایدا دەگەڕێن...؟! سیاسەتی چی و پارتایەتی چی بە هیچ شێوەیەك ئاگام لە هیچ پارتێك نی‌یە وەهیچ هاوڕێیەکیشم نی‌یە لەبەر ئەوەی کوڕی کابرایەکی هەژارو دەست کورتم ، بۆیە لەو قسانەی ئێوە زۆر دوورم وە بێ ئاگام لێی !

پاش هەندێك لە ووتەی ناشرینی نامرۆڤانە : ئیتر هەر خۆیان دەزانن کە ئەشکەنجەدان چۆنە وەچۆن جەستەی‌کەسانی وەك ئێمەیان کردۆتە تاقیگای لێدان و هەڵواسین ... جەللادەکانی ڕژێم ئەوەندە چەشەبوون لە لێدان و ئازار دانی کوردانی نێو زیندانی مەگەر هەر خۆیان بزانن چی بەسەر مرۆڤا دێنێ وە مرۆڤ بە تەواوەتی لە مرۆڤ دەخەن ؟! ئەوەی مرۆڤایەتیش بێت لە ئاست بەرژەوەندی‌یەکانی (( پترۆڵ دا)) بۆ وولاتانی زلّ هێز خۆیان لە نەتەوەیەکی بن.

دەستی کورد کردۆتە ((کەڕەی شەربەت)) وە ڕژێمی بەعسی فاشی بێ باکانە بەرامبەر مافی مرۆڤ بە کردەوە دژە مرۆڤایەتی‌یەکانی‌دا سەلماندوویانە کە ئەوەی پێی بوترێت مافی مرۆڤ . مافی گەلانی تری عێراق وەکو نەتەوەی کوردو کەمە نەتەوایەتی‌یەکانی تر لەلایەن قامچی دەستیانەوەو قولاپی هەڵواسینیش تاکە ڕێگای فاشی‌یەتی ئەم ڕژێمە دەسەلمێنێ ، بۆیە زیندانەکانی سیخناخ کردووە لە کەسانی نیشتمان پەروەرو شۆڕشگێڕی کورد بەڵێ فڕێیان دامە ئاودەست خانەیەکەوە ، دەرگام لێ داخرا تاوەکو شەو ، نزیکەی (نۆ) شەو لەوێ دا مامەوە ..

پاش (٩) شەوی ڕەبەق جارێکی تر بانگیان لێ کردم : وەرە دەرەوە .. هەی بەد فەساڵ ، پاش هاتنە دەرەوەم لە ژوورێك دا دایان نام وە کەوتنە قسە کردن لە گەڵم ..! لە دڵی خۆمدا دەم ووت (( چیم لێ دەکەن ! ئەبێ ئەم جارە نیازیان چی بێت ... ئەبێ ئەم گرتنە سەری لە کوێوە دەربچێ !؟ هەڵبەت دوا جار بۆم دەرکەوت کە داوای ئەوەم لێ دەکەن کە ئیمزای بکەم ((چونکە لە کارەکەمدا داوای ئیمزایان لێکردم بۆ ئەوەی ببم بە لایەنگری حزبی بەعسی عەرەبی‌اشتراکی ، بەڵام ڕازی نەبووم)) دواتر داوای درکاندنی نهێنی‌یەکانم لێ دەکەن ؟! وەڵامم چی بێت ؟!! ((با خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەشکەنجەی ئەم جەللادانە ؟!.. هەرچی لە دەستیان دێت بابیکەن ، هێندە وورەم بەرز بوو بە خۆمم دەووت مرۆڤی مەردو شۆڕشگێڕ گەر مردیش بۆ نەتەوەکەی گیانی دەبەخشێت ، بەڵام مرۆڤی دژ بەگەل و نیشتمان کە مردیش دەچێتە زبڵدانی مێژووەوە.. وە مرۆڤ یەك جار دەمرێت ، لە مردن زیاتر ئیتر چی هیە ؟!))

وەك مۆتەکەیەك کەوتنە دواندنم وە ووتیان : کاك مەحەمەد هەرچی دەزانی پێمان بڵێ و خۆت تووشی دەردەسەری و ئەشکەنجەدانی خراپتر مەکە ،!؟ پێمان بڵێ و بچۆرەوە بۆ ناو منداڵەکانت ..! ، بائیتر چی دی چاوەڕوانت نەبن لەبەر دەرگا .. !!

، ئەخۆت تووشی کێشەبکەو ئەئێمەش ماندوو بکە ؟! ئیتر پێویست بەو هەموو قسە کردنە ناکات لە گەڵتا بۆت بکەم !...

((منیش لە وەلامدا پێم ووت : (( گەر ئێوە ماوەی من بدەن چەند قسەیەك بکەم بۆتان ..، جەللادەکان لە خۆشیاندا ووتیان فەرموو قسەبکە بابە دەبوو لەیەکەم ڕۆژەوەخۆت تووشی ئەم ئازارو ئەشکەنجەیە نەکردایە ...؟!

کەوتمە دواندن من بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیم بە کەسەوە نی‌یە وە پیاوێکی کاسبم وهەژارم ، دەستم بە کلاوەکەی خۆمەوە گرتووە کە با نەیبات ، خەریکی بژێوی ژیان و گوزەرانی خاوخێزان و منداڵەکەی خۆمم )) !!

ئەوشتانەی ئێوە دەیڵێن زۆر دوورە لە ڕاستی‌یەوە وە لەمن :

*دیارە ئێمە درۆت لەگەڵ دەکەین ..!؟

-ئیتر خێرباری بەسەرمدا !!؟

پاش ماوەیەکی زۆر ، ئەوەندە ئاگام لە خۆبوولە جێگایەکی تاریك دا فڕێ درام ، نەم دەزانی کات شەو ، نیوەڕۆیە ، بەیانی‌یە ..؟! چۆن ئەو زیندانەی منی تێدا فڕێ درابوو هەوای ئاسایی کەم بوو ، ئەوە تیشکی خۆر هەر نەدەبینرا بۆیە لای من شەوو ڕۆژ وەك یەك بوو بۆمن .. بە درێژایی ئەو ماوەیە یان لە تاو ئازارو ئەشکەنجە بێ هۆش دەبووم یان جێگاکەم بەردەوام تاریك بوو ... بەڵێ وازیان لێ نەهێنام .. جارێکی کەش وەك کاتەکانی تر هاتن و چاویان بەستمەوەو بردمیان ... کاتێك چاویان کردمەوە ؟! چی ببینم بە ئاستەم چاوم بۆ هەڵدەهات سەیرم کرد ئەمە بەدیخانەیەکە پڕە لە خەڵك کە زیندانی کرابوون .. ئاهێکم پیا هات و وام زانی خەڵات کراوم چاوم بە نێو خەڵکەکەدا دەگێڕا و خەڵکە زیندانیەکانیش هاتنە پێشەوە بۆ لام

هەریەکەو پرسیارێکی لێ دەکردم ..؟! منیش لە هەموو شێوازێکی ئەو ڕژێمە تێ گەیشتبووم نەمدەتوانی وەڵامی هیچ کەسێك بدەمەوە کە لە زیندان دا بوون لە ژوورەکەدا .. لە چاوانی ئەوانەی زیندانی بوون لەگەڵ مندا ئەوەم

ەخوێندەوە کە زۆریان پێ ناخۆشە منیان (کوردێکی وەك خۆیان بەو شێوەیە بینی ؟!...).

ەوەدا بووین ، لە پڕ لە دەرگا درا وە بە دەنگێکی ناخۆشی دڕندانەوە بە زمانی عەرەبیەکی شڕوگی هاواری کردوو دەرگا کرایەوە ، تەماشام کرد ؟! ەر زیندانی‌یەك .. سەموونێکی ڕەقیان بۆ هێناون ئەوانیش وەریان گرت ، دووبارە من وەرم نەگرت ؟! پیاوێك لە زیندانی‌یەکان هاتە لامەوە بە چرپە پێی ووتم کاکە گیان خواردن لەوە زیاتر نی‌یە ، لە برسان دەمریت ، چاکترە وەری بگری بەڵام من بە دەست ئاماژەم بۆ کرد کە نامەوێ ماوەیەکی زۆر کەوتم ، ئەوەی هێزوو ووزە هەبوو لە جەستەی من دا نەبوو ، وام دەزانی سەرم لەلاشەم جیا کراوەتەوە .. هەرچەند بیرم لەوە دەکردەوە نەك سیخورێکی ڕژێم تێدا بێ قسەکان بگەیەنێ ، لەو لاشەوە جەستەم هاڕابوو بەسەر یەکدا ..

پاش ئەوەی چەند ڕۆژێکی ترم لەو زیندانەدا بردە سەر ،زیندانەکان هەندێ سەموونە ڕەقی خۆیانیان بۆ کردمە ئاوەوەو کردیان بەدممەوە بە ئاستەم بۆم دەخورا ووردەووردە هاتمەوە سەر خۆم و هەندێ هێزی پێ دام سەرم بەرزکردەوە ... پیاوێك هەر دەهات بە لامداو قسەی لەگەڵم دەکرد :((پێیان دەوت حەسەن مەحموود)) لە کۆتاییدا ووتی نازانم چی بڵێم ؟! ئەم ڕژێمە ئەوەندە دڕندەیە پیاو ناتوانێ لە ماڵی خۆی قسە بکات ؟! قسەکانی خۆی داو ووتی :هەندێك شتم لەسەر بوو هەمووی وەکو خۆی چۆن بووە دەیانزانی‌و بۆم گێڕانەوە چونکە لە خۆم زیاتر ئاگایان لێ بوو ، ئیدی هەستم کرد ئەم پیاوە واز ناهێنێ و لەوانەیە خۆی فرۆشتبێ بە ڕژێم ... ووتم :ـ مامە گیان ناتوانم وەڵامت بدەمەوە و قسەم پێ ناکرێت ئەوەتا بە زۆریش ناتوانم قسەم بۆ بکرێت ..

وتی:ـ (من بۆخۆت دەڵێم .. چونکە چی تر بەرگەی ئەشکەنجەدان و هەڵواسین ناگری !ئەگەر بە قسەی بە من دەکەیت ، هەرچی دەزانی بۆیان باس بکەو پێیان بڵێ چۆن ئاشکرایە لای خۆت ئەوان باشتر دەزانن ) ؟
*وتم مامە گیان تکات لێ دەکەم وازم لێ بهێنەو من هیچ نازانم ؟! برۆ سوود لەیەکێکی تر وەربگرەو ئەوەی لێیان وەرگرتووم هەر ئەوەیە !
–وتی : (ئەم پیاوە شێت بووە ، تۆ وادەزانی من چیم ، منیش وەك تۆ زیندانم ... بەڵام نارحەتم بۆئەوەی ئازار و لێدانی تۆ کە ئەشکەنجە دراوی ؟!
* منیش پێم وت مامە گیان لە کۆڵم بەرەوە .. ڕاستە .. تۆ ڕاست دەکەی بەڵام من لەسەر خۆم نیم ، حەز دەکەم بوارم بدەیت و ناتوانم قسە بکەم .. ؟
زیندانیکی تر ماڵیئاوابێ لێی تورە بوو پێی وت .. کابرا ئەوە تۆ بۆ واز لەم پیاوە ناهێنی ؟ ..نیازت چییە ؟! ئەوە ئەتەوێت چی پێ بکەیت ؟ .. ها نهێنیت بۆ بدرکێنێ ؟! ئەوی داماو ئیسك و پروسکی لەیەك داڕژەندراوەو تازە بە تازە تۆ دەتەوێ لە نوکەوە تێ هەڵبچێتەوە . کابرای زیندانی کە ئەم دەناسی پێی وت تۆ چیت داوە لە م قوڕبەسەرە ، دەی لە کۆڵی بەرەوە ، بۆ نازانی ئەوە سێ ڕۆژە دایان ڕزاندوە لە ژێر ئەشکەنجە دا ، ئیتر چۆن دەتوانی وەڵامی تۆ بداتەوە و بیکەیتە دەسکە گوڵی خۆت و بە خەڵات بۆ پیاوانی ڕژێمی بەریت ؟! پاش ماوەیەك .. بانگیان کردم ،نان خواردنە ، سەرنجێکم داو تێڕامام کە هەریەکەو سەمونێکی ڕەق و لە تێك خەیارياز هێنا، من ئەمجارەش وەك جارانی دی وەرم نەگرت ، بەڵام برادەرانی زیندانیم بە زۆر دایان پێم و تاوەکو جوڵەو ووزە بکەوێتەوە گەڕ لە ناو جەستەم دا ..
برادەرێکی زیندانی زۆر هەوڵی لەگەڵ دام و پێی ووتم :ـ
کاکە گیان ئێمە لە ناوماندا هەیە ماوەی ساڵێکە ئەمە جێگەیەتی ، وە لەما زیاتر نان نییەو دەبێت خۆت ڕابهێنیت و بیخۆیت .. تاوەکو نەمریت . پ شماوەیەك لە ئازارو ئەشکەنجەی نامرۆڤانەی ڕژێمی بەعس ، جارێکی دیکا

بانگیان کرد ، نان خواردنه ، سەیرم کرد (( بە شێوەیەك ئەو سەمونە ڕەقە
ڕێ ئەدەنە بەردەم زیندانی‌یەکان ، وەك بڵێی زیندانی‌یەکان لە هەموو
ەهایەکی مرۆڤایەتی داماڵراون و مامەڵەی ئاژەڵیان لە تەکمان دەکرد .
ە تاو برسێتی و ئازارو ئەشکەنجەیەکی شۆڤینستانە ، هەر زیندانییەك
سەمونێکی ڕەق و لە تێك خەیاریان هێنا ...! بەلام من ئەمجارەش وەك
ۆژانی تر وەرم نەگرت ، بەڵام برادەرانی زیندانیم بە زۆر دایان پێم ، کە
ەهەر چۆنێك بێ بیخۆی چاکترەو .. دەنا هیچ ووزەو توانایەکت نامێنێ و
ەو کات ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سست و لاواز دەبی و دواتر دەمری لە برسانا !؟
یدی سەموونە ڕەقەکەم ، وەرگرت و توانیم هەندێکی لێ بخۆم ) ..
ە هەر حاڵ ئەوە جێگام بوو ، پیاوێك کە پێشتر لە زینداندا بوو بە هۆی ڕۆح
موکی کە خاوەنی کەسایەتیەکی بە هێزی خۆی بوو ، وەك کورد دەڵێ
یاوێکی مێر خاس بوو .. لە چاوانیدا ئەزموونی زیندانی فاشستەکانی
ەزانی بە ناوی (عبدول ڕەحمان) ، هاتە لامەوەو لە یەکتری زۆر
وردبووینەوە ، لە ویژدانی خۆم دا ئەم پیاوە سوودو کەڵکی تەواوی
یندانی‌یەکانی دەویست ! پاش چەند سەرنج و تێڕامانێك ، سەری
ەرزکردەوەو وەك بڵێ بیەوێ چەند پرسیارێکم لێ بکات ، بۆچوونەکەم لە
جێگای خۆیدا بوو ! پرسیاری لێ کردم ، ڕاشکاوانە و بەلام خەمخۆرانە پێی
وتم :- (خۆ هیچت نەدرکاندووە ؟)منیش سڵەمیمەوە ...!! ووتم (بە قوربان
ن هیچ نیم تاوەکو هیچ بدرکێنم ) پێم ڕاگەیاند : (( براشرینەکەم بۆ وازم لێ
اهێنی ...؟!

ەو برادەرە زیندانی‌یەم ، هەر سوور بوو لەسەر پرسیارەکەی ، بۆیە دووبارە
ێی ڕاگەیاندم .. کاکە گیان من لەبەر دڵسۆزی پێت دەڵێم ، وەئەگەر لە
سێدارەشت بدەن . هیچ مەدرکێنەو نەچیتە ژێر فشاری ئازارو ئەشکەنجەو
اپلۆسین - ی پیاوانی ڕژێم ، وە لەوانەیە هەموو شێوازێکی جۆراو جۆر

بگرنە بەر بەرامبەرت و هەوڵت لەگەڵدا بدەن کە کاغەزی سپی‌یان پڕبکەیتەوە و دوا جاریش ئیمزات پێ بکەن بە زۆر ، بۆ یە برام ئەگەر پەنجەشیان بڕیتەوە ، ئەوا وەك برادەرێکی دڵسۆز پێت ئەڵێم خۆڕاگریە لە هەموو شتێك چاکترە و باشترین فریاگوزاری‌یە بۆ ڕزگار بوونت لە زیندان . هەروەها لای کەس قسەمەکە، چونکە ئەو زیندانەی کە دەیبینی ، وا بیرمەکەرەوە هەمووی کەسانی نیشتمان پەروەربن ، بەڵکو کەسانی سیخوڕو خۆفرۆشیشی تێدایە کە بۆ چاودێری کردن خراونەتە زیندانەوە بۆیە پێت دەڵێم :ـ ئاگاداری خۆت و زمانی خۆت بکە ، نەوەك سیخوڕەکانی ڕژێم قسەت لێ دەربهێنن ، ئەمەت بۆیە پێ دەڵێم کە ئاگات لە حاڵی خۆت بێت ، و دڵی خۆت بۆ کەس نەکەیتەوە ، بە تایبەت ئەو کابرایەی کە ناوی حەسەن محمودە) . چونکە سەربە دەزگا چڵکاوخۆرەکانی ڕژێمەو کەسێکی خۆفرۆشەو با ئەو ڕاستی‌یەش بزانی کە زیندانی نی‌یە ، بەڵکو تەنها دایان ناوە لە زینداندا بۆ وەرگرتنی زانیاری و کاری نهێنی ، وە دەیەوێ بە هەڵەیا تۆ بەرێ تا سوود وەردەگرێ ، ئەمە ڕاستی‌یەکە و زۆر لە زیندانیەکان دەیناسن چ پیاوێکە .. کە چەندین کەسی ماڵ وێران کردووەو ملی کردوون بە پەتی ئەم دوژمنە سەرسەختەی گەلانی عێراق بە گشتی و گەلی کوردستان بە تایبەتی .

براکەم : تا بتوانی زۆر بە وریاییەوە ئاگات لە (حەسەن مەحمود) بێ ، چونکە ئەو کاسەلێسە (گورگەو لە پێستی مەڕدا ) خۆی نیشان ئەدات ؟

کات بەرەو ئێوارە دەڕۆیشت ... هەموو زیندانی‌یەکان کەشەو دەهات وەك خۆڵە مێشیان پێ دا بکرایە ، خەم و پەژارە دایدەگرتن و ترس لە چاویان دیار بوو ، لێدانی دڵ لە شێوە ئاساییەکەی خۆی دەرچوو بوو ، تادەهات زیاتر ترپەی دڵی خۆم گوێ لێبوو ، وەك لە چاوەڕوانیەکی مەرگ ئامێزدا وەستابین بەو چەشنە بوو .((زۆر جاران بیر لەو قسەی بابم دەکردەوە کە پێی دەگوتم :ـ کوڕی خۆم ڕۆح زۆر شرینە)) ئەمێستا ڕاستی بۆچوونەکەی

بابم بۆ ڕوون بۆوه ، بەڵێ ڕۆحی مرۆڤ و تەنانەت گیان لە بەرانیش بە نیسبەت خۆیانەوە شیرینە ، تاوەکو نەبنە نێچیری ڕاوکەرێکی چڵێس یان گیان لەبەرێکی گەورەی دڕندە بەڵام ((من لەبەر ئەوەی پەیمانم دابوو بەسەر بەرزی بژیم لە پێناوی خاك و نیشتمانی کوردو کوردستان دا ، وازم لەوە هێنا بوو کە چی خراپتر بەسەرمدا بێت بە شێوەیەك وا خۆم نیشان نەدەم کە لاواز و بێ ئیرادەو بڕوام ، هەر ئەو ئیرادە نەتەوەیەشم بوو زیاتر و زیاتر چەسوورانە بوەستم لەبەردەم هەر فەرمانێکی دڕندانەیی ڕژێمی فاشی بەغدادا)) لە چاوەڕوانیدا بووین ئێوارە هات و خواردنیان بەسەرمان دا دابەش کرد ، لەتە سەموونێکی ڕەق و یەك تەماتە و هیچی تر ...!

کات تێ دەپەڕی و نزیك بووەو لە (٩)ی شەو ... بە شێوەیەکی دڕندانە و تۆقێنەرانە لە دەرگایان دەدا و پاش ئەو ئەشکەنجە دەروونییە هەر خۆیان دەرگاکەیان کردەوە ..(ڕەسوڵی هەمزا تۆڤ) ڕاستی ووتووە ((ئەو دەرگایە مەشکێنە کللیل بە ئاسانی دەیکاتەوە )) بەڵام ئەم جاللادانە لە ئینسانیەت دەرچووبوون و هیچ یاساو ڕێسایەکی ئاسمانی و زەوی ئەم جەللادانەی نەدەگرتەوە ئەو کاتەی خۆیان کرد بە ژووردا ، هەموو لە ترسان خۆیان گرژ کردبوو ، یەکەم ناو بانگی منیان کرد ، دەست و چاومیان بە پەڕۆیەکی ڕەشی قەترانی توند بەستەوە و بردمیان ... ، دواتر چاویان کردمەوە ؟!

لە ژوورێکی ڕازاوەو خۆش ، چەند جەللادێك دانیشتبوون ،بە دەست جێگای دانیشتنیان پێ نیشان دام ، یەکێکیان سەیری کردم و ووتی تایەك چارەکی تر مۆڵەتت هەیە و (بیربکەرەوە بە باشی) ؟! دوایی هەر چیمان کرد بەرامبەرت مالی خۆمانە ..! هەرچی دەزانی پێمان بڵێ ! ئەو پارتەی کاری تیا دەکەی ؟ چەند کەست لە گەڵدایە ..؟ واز لە کەللە ڕەقی بێنەو بکەرە خۆت ، ئەوا چارەکە سەعاتەکە تەواوبوو !؟ ئامادبە دەی !؟ وەڵاممان بدەرەوە ، زووکە ئەو کارانەی کردونت بە بیر خۆتی بهێنەرەوە ؟ ئەمجارەیان بووردنی

تێدانی‌یە !.. منیش ووتم هەر ئەوەیە کە پێم گووتون ، جگە لەهەژاری و قوڕ بەسەری چی تر نازانم و ئاگام لە هیچ شتێك نی‌یە . (ئەگەر مرۆڤ ئاگای لە هیچ نەبێ و هیچ نەبێ بیر لە چی بکەمەوە ! وەخۆم بە تاوانبار نازانم)! یەکێك لە جەللادەکان .. بە هەموو تواناای خۆی نەڕاندی و شەق و زللەیەکی لێدام ووتی چەنە بازی مەکە و لە وە زیاتر دەم درێژی مەکە !؟

بە قسەکانی جەنابت بێت . ئێمە تاوانبارین کە تۆمان گرتووە ، تۆیش بێ تاوانی وانیە؟! ((ئەم قسانەی‌بە شێوەیەك پێ ووتم . کە بڵێی یاری بەوان بکەم)) .

پێم ووتن قوربان ئێوە ڕەنگە من بە کەسێکی تر تێگەیشتبن ...! من ئەو کەسە نیم ، ئەم ووتوە و ناڵێم ئێوە تاوان بارن ، بەڵکو ئێوە خاوەن دەسەڵاتن چ چۆن تاوان دەکەن ، وەکەسیش ناتوانێ ئەو قسانە بکات ...؟ ((لە دڵی خۆمدا ووتم ئەگەر تاوان بکەن ، یان نەیکەن ، کێ دەتوانێ بڵێ کردووتانە و بەری چاوتان کلی پێوەیە و کێ دەتوانێ لەبەردەم وەحشیەتی ئێوەدا بڵێ لەل)) ؟!

هەرچی‌یان کردوو هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردم ، لە سێدارەدانیان خستە بەردەمم ، تاوەکو بترسم و پەشیمان ببمەوە ، بەڵام بێ سوود بوو هەر لەسەر قسەی خۆم سوور بووم .

دواتر کە زانیان هەرچی بکەن لەوە زیاتر لەمن هەڵناکرێنن و بێ سوودە بۆیە پێیان ووتم خۆت ڕووت بکەرەوە بەهەر حاڵ .. ڕووتیان کردمەوە بە زۆر و درندە ئاسا ؟! بتڵە شوشەیەکیان هێنا و پێیان ووتم :ـ دەبێ خۆت باریك بکەیتەوە و بچەمێیتەوە ناو ئەم شوشەیەوە ؟!

بەڵێ سوکایەتی بەو شێوەیەش خراپتر دەکەن بە مرۆڤ ، ئەوەی نرخی نەبێ لەلای ڕژێمی بەعسی عەرەبی خوێن ڕێژ ... مرۆڤە ...!

، دوای ئەو کارە دڕندانەو نامرۆییانە، دووبارە کەوتنە ڕێزەم و ئەمجارەیان
پرسترین لێدانیان لێ دام بە کێبڵ و لێدانی کارەبا و هەڵواسین .. من ئاگام لە
خۆم نەماو ئیتر چەند لێیان داوم نازانم ..! بەڵام کاتێك هۆشم هاتەوە زانیم لە
ورێکدام ، بەڵام نەم زانی ژێر زەمینە یان ئاو دەستە یان چ جێگایەکە منیان
یا فڕێ داوە .؟! بۆنێکی زۆر ناخۆش ئەهات بە لووتمدا لە ئەشکەنجەدان ،
ئەتێکی کەمتر بوو ... ئەویش لەبەر کەم توانای خۆم هەستم زۆر پێ نەکردبێ
.. ؟

ۆ سبەینێ .. دەریان هێنام و چاویان کردمەوە ، پاشان زانیم کە ئاودەست
وو ، کەلە دوای ئەشکەنجەکەی دوێنێ وە تێدا بووم .
باش چەند چرکەیەك وەستان ، ئیتر نەمزانی چۆن ڕەحم و بەزەییان پیا
هاتبووە کە ئەو ماوە کەمە ڕایان گرتم ، دواجار چاویان بەستمەوە و بردمیان
!؟

کە چاویان کردمەوە ، بینیم ، ناو زیندانەکەیە ... سەرم گێژی ئەخوارد ،
پاش چەند خولەکێك
(عبدول ڕەحمانی) برادەری زیندانیم هاتە لامەوەو ووتی :ـ (حاڵت چۆنە)؟
منیش ترسم لە عبدول ڕەحمان نەبوو ، ئیتر حاڵی خۆمم بۆ گێڕایەوە لە
سەرەتاوە تاکو بتڵەکەش ؟! ئەویش بەهەموو توانایەکییەوە کەوتە دڵدانەوەم
.. پێی ووتم :ـ کاکە گیان ئەوە هیچ نییە و پیاو دەبێ خۆڕاگربێت ، دوژمن
هەر دوژمنە ، نابێ هیچ پێت ناخۆش بێت ، بەسەری تۆو بەسەری خۆشم
(خێزانەکەمیان هێناو هەر لە بەرچاوم هەرچی سوکایەتیەك هەبوو لەگەڵیان
کرد ... !!) .

((ئەم دڕندەیە ، حکومەت نییە ، لە هەموو داب و نەریتێکی مرۆڤایەتیەوە
ئاسمان ڕێسمانیان بەینە ، جا بۆ ئەوەی بزانیت من ئێستا لە جاران زیاتر
خۆڕاگرترم و خێزانەکەم زیاتر خۆش دەوێت .. جا برا شیرینەکەم ئەوە

دوژمنە بۆیە حەز دەکەم دڵگران نەبیت ! دەبێ بزانی کە داگیر کەر هەموو کردەوەیەکی نامرۆڤانەی لێدەوەشێتەوە .
بۆیە تۆیش پێویستە ئەمجارە زیاتر خۆڕاگرتر بیت و زیاتر ڕقی پیرۆزت ئەستوور تر بێت و خۆتی بۆ ئامادەبکەی ، ڕۆژێك دەبێ وەکو بورکانێکی پەنگ خواردوو بتەقیتەوە بە ڕووی ئەم داگیرکەرە خوێن
ڕێژە فاشستەدا و لە ناویان بەرین و خۆمان ڕزگار بکەین)) .
بەڵێ :ـ ئیتر هەر زیندانیەك ، بە پێی بیروڕای خۆی دەهاتن و پرسیاریان لێ دەکردم ، هەریەك بە شێوەیەك لە شێوەکان ...؟
جارێکی تر پاش بێ دەنگی کاك عبدول ڕەحمان ((لێم نزیك بووەوەو بە ئەسپای پێی ووتم :ـ کاکە محمد ، هەتا دەتوانی بێ دەنگی بۆ خۆت هەڵبژێریت چاکترە و وەڵامی کەسی ناو زیندانەکەش مەدەرەوە ، چونکە ئەمە لە بەرژەوەندی خۆتدایە و ئەمانەی لێرەن هەموویان وەك یەك نین و هەمەجۆرەی تێدایە ، چاك و خراپ تێکەڵە ،.. وە بەقسەی کەس باوەڕ نەکەی چونکە هەندێکیان ئەیانەوێت هاوڕێ بۆ خۆیان پەیدا بکەن ..((چونکە خۆیان نهێنی‌یان درکاندوەو هەندێکی تریشیان خۆیان فرۆشتووە و دەیانەوێت قسەت لێ دەربهێنن و خۆیانی پێ بەرنە پێشەوە ، برای خۆم تەنها دووشت ڕزگارت دەکات و سەرکەوتوو دەبیت ،.. ووره بەرزی و خۆڕاگری گەورەترین سەرکەوتنە و پیاوەتی‌یەو شەرەفە لە ڕێگای نیشتمان پەروەری و کوردایەتی وە ئەوەیە بۆ تۆ لە کاتی ڕزگار بوونت دا لە زیندان ، وە لە ناو کۆڕو کۆمەڵیش دا سەربەرز دەبیت ، خۆ ئەگەر لە سێدارەشت بدەن ، کەسو کارو هەڤاڵەکانت و دەووروبەرت ، خۆڕاگری و نیشتمانپەروەری و مێرخاسی و کوردایەتیت بۆ خۆیان و نەوەکانی دەهاتوومان دەڵێنەوە ، وەهەر مرۆڤێك ـ یش دەبێ ڕاستی‌یەك بزانێ کە هەر دەبێ بمرێ ، بەڵام چ مردنێك ، مردنی‌لە ڕێگای خاك و نەتەوەکەی خۆیدا سەربەرزی و بە نەمری دەمێنێتەوە ، وە

مرۆڤ دەبێت هەمیشە ڕێگای سەرفرازیو ڕزگاری هەڵبژێرێ و نەك لە ناو ماڵ و جێگادا گیانی دەربچێت و کەس باسی نەکات و بمرێت و تەواو ...
لە ژیانی سەرشۆڕیدا زۆر کەس هەیە مل کەچ دەکات و دەمرێ بەبێ ئەوەی کەس ناوی بهێنێت ، بەڵام چەندین مرۆڤی سەربەرزو شۆڕشگێڕ لە پێناو خاك و نەتەوەکەیدا گیانی پیرۆزی پێشکەش کردووە و بۆ هەمیشە نەمرو زیندووە و ناوی دەبێتە وێردی سەرزمانی نەوەکانی ئێستاو داهاتووی نەتەوەکەمان جابرای ئازیزم بە دڵسۆزییەوە ئەم قسانەت بۆ دەکەم)) ؟
ئیتر هەر چۆنێك بێت منیش وەڵامی (کاك عبدول ڕەحمان)م دایەوە .. جارێکی تریش بەڵێنی خۆمم دووپات کردەوە کە ووشەیەك لە من نەبیستێ و لە چاکی تۆش دەرناچم کاك عبدول ڕەحمان .
کاتێك دەبینم هێندە بیرو هۆشت بە میتۆدێکی شۆڕشگێڕیو کورد پەروەرانە جۆش دراوەو خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێزی بۆ بەرگری کردن لەم نەتەوە بن دەست و چەوساوەیە ، ئیدی بە خەیاڵیشم دانایەت ئەگەر پەتی سێدارەشم بۆ هەڵواسن ، نەك هەر چۆك دانانەم بەڵکو بەرپەرچی بڕاوە بەرەو پیری پەتی سێدارەی بەعسی‌یە فاشی‌یەکانی عێراق دەچم .
لەو ڕۆژەوەی لە زیندانی فاشی‌یەکان دا کەسێکی شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەرم ناسی ، زیاتر تین و تەوژم و جۆشدانی خۆڕاگریم زیاتر بوو

کات زۆر بە خێرای تێ دەپەڕی و .. شەو هات دڵ خورپە و لێدانی دڵی هەر زیندانی‌یەك تا دەهات زیادی دەکرد ، بە تایبەت ، کەشەوانە لێپرسینەوە هەبوو ...!
کات ژمێر (١١)ی شەو بوو ، پیاو کوژەکانی ڕژێمی بەعس ، بانگیان کردمەوەو پشتەملیان گرتم و بردمیانە دەرەوەو وەکو ڕۆژانی تری ئەشکەنجەدان چاوانمیان توند شەتەك دەکردو بە پاڵ بردمیان .. بەرەو

مەبەستە گڵاوەکانی خۆیان ...؟! کاتێك چاوم کرایەوە ، لە هەمان ژوردا ، هەمان دەم و چاو و هەمان جەللادی بەعس .. هات و بە تورەییەکەوە تێی خوڕیم ، ها (حەمە) .. بووی بە پیاو یان هەروەکو جاران ئەم سەرو ئەو سەرمان پێ ئەکەیت ؟! ئەمەی ووت و .. ((دایانە قاقای پێکەنین ؟! تەنانەت شێوەی پێکەنینەکەشیان هەر شێوە گاڵتە کردنێك بوو بە من ... پاش (١٠) چرکە کەوتنە قسەکردن دیسانەوە لەگەڵمدا .. ، بڵێ بزانین حەمە ، قسەبکە ؟! وەڵامم دانەوەو ... پێم ووتن چی بڵێم ، هیچ شتێك نازانم ، هەر ئەوەی پێم ووتون لەوە زیاتر هیچ مەسەلەیەکی تر نازانم ... ؟لەوەڵامی جەللادەکاندا پێیان ووتم :ـ هەی ..هەی ..هەی ..دیارە زەرنەقوتەیەکی وەك تۆ پێمان رادەبوێرێ ..؟ هەر ئێستا بە چاوی خۆت دەیبینی ؟! هەر کەس هاتبێتە ئێرە کردوومانە بە پیاو ئادەی ناوی برادەرەکانت بڵێ ، هەرچەندە ئێمەناوەکانیان دەزانین ؟! بەڵام بزانین تۆ تاچ رادەیەك ڕاستمان لەگەڵدا دەکەیت :؟! وانەزانی کە ئێمە لە گوێی گادا خەوتوین و هیچ زانیاریەکمان نی‌یەو نازانین و ئاگامان لەو چروچاوانەی وەکو تۆنی‌یە ؟! باوەرم پێ بکەن هەر ئەوەی کە گووتومە لەوە زیاتر نازانم و ئەگەر باوەڕیشم پێ ناکەن ، ئەوا دەسەڵاتم نی‌یە ؟!.. باشە حەمە (لەگەڵ پێکەنینێکی زۆر ناقۆڵاو ناحەزانە ، دەستی برد بۆ چەکمەجەی مێزەکەی بەردەمی خۆی) ؟ کاغەزێکی سپی لە پەڕاوێکدا بوو دەرهێناو پێی ووتم :ـ ئادەی ئا لەم پەڕەواداو لە یەکێك لە کاغەزەکانی ناوی دا ئەو کاغەزەمان بۆ ئیمزا بکە ؟!!

منیش ووتم :ـ پەڕاوو کاغەزی سپی ؟! باشە بۆچی ئیمزای بکەم ... ؟! نا... نا..ناتوانم ئیمزای بکەم !؟ جەللادەکەش هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی هەر دەبێ ئیمزای بکەم ، پێی ڕاگەیاندم تەنها بۆ ئەوەمانە ئیمزاکەی خۆت لەگەڵ ئەونامانەی کە گیراون و ئیمزای تۆی لەسەرە یان نە تاوەکو بەراوردێکیان بکەین !... ئەگەر بڕوا دەکەن نەنامەم نووسیوەو نە ئیمزاشم هەیە !!

ەللادەکەی زیندان بە تورەییەکەوە بەردی ئـەباران :ـ بـە شـێوەیەکی زۆر شرین پێ‌ی ووتم ( هەر دەبێ ئیمزای بکەیت و درێژەی پێ مەدەو ئینکاری گەڵ ئێمەدا ئەتوانی بکەی ؟ پاش چەندو چونێکی زۆر هەوڵم دا خۆم ڕاگرم هەوڵەکەیان لەبار بەرم بەڵام کەوتنە سوکایەتی پـێ کردنم و ئـەوەی دەیـان ووت بتکردایـە بـە دەمـی سـەگەوە بۆنـی پێـوە نـەدەکرد .. جنێـو پێـدان و ـەی ناشرین وەلە هیچ قاموسێکی دنیادا نەگوێم لێ ببوو نە بیستبووشم ؟!

ەڵام بـاش بـوو ئەمجارەشـیان وازیـان لێ هێنـام و سـەرکەوتوو بـووم .. ‌یانتوانی سوودم لێ وەربگرن ....پاش ئەمە ووتـی ئادەی ئـەم قوڕم سـاغە ڕنەوە بۆ جێگای خۆی ... چاویان بەستم و بردمیان ... بە هۆی پێپلیکانەی ‌درمەکاندا هەستم کرد دەم بەنەوە بۆ ژێر زەمینەکە .

‌و کات چاویان کرمەوە .. بەڵام ژێر زەمینـی چـی .. بۆنێکی وای لێ دەهات ‌ورد واتەنی :ـ (سەرداری بێ سەر دەکرد) .

ستەوخۆ ووتیان خۆت ڕووت بکەرەوە ، تەنها دەرپـێ کورتەکەم لـە پـێ دا ابوو ! بە زۆر ئەوەشیان پێ داکەنم ..! کەمێك بردمیانە ئەو لاوە سەیرم کرد . بزمار ڕێژە دایان ناوە بۆ ئەشکەنجەدان !

‌ زۆر لەسەر دەم منیان پاڵ خست ،هەموو لەشم کەوتە سـەر نووکی بزمارو ‌ بە دەمی خـۆی چـی بزمـارە بوو دەچوو بەلـەشمدا ؟! بـەڵێ لاشـەم بوو بـە ‌ۆراکی بزمارو شتێکی زۆر قورسیان لەسەر پشتم داناو بە جێیان هێشتم ؟!

‌ تاو ئازارێکی زۆر بورامەوەو لە هۆش خۆم چووم و بێ ئاگا بووم لە خۆم .. ‌م نەزانی چەند کات تێپەڕ بووە کات .(شەوە ..یان ڕۆژە) !؟ لە پڕ دەنگێکی ‌ۆر بـەرز هـاواری کـرد (هـەی خوێـڕی) هەسـتە .. وویسـتم هەسـتم ؟ بـەڵام ‌ەمتوانی هـێزی هەستاندنیشـم نەبوو ، وەهـەموو لاشـەم سڕ ببوو .. کـاتێك انیم هەڵیان ساندم و ئەمجارە بە پشت داو بەسەر بزمارەکاندا ڕایان کێشـام ئاسنێکی قورسیشیان خستە سـەر سکم ، لاشـەم تـەواو خـەڵتانی خوێـن

ببـوو ، لاشـەمیان کردبـوە خۆراکـی بزمـاری بەعسـی عـەرەبی ... ، ؟
ئەمجارەشیان بێ هۆش کەوتم و بورامەوە !
کاتێك هۆشم هاتەوە ! لە ناو بزمارەکاندا نەمابووم ، لە جێگایەکی تردا فڕێ
درابووم ، بەڵێ ئازارم زۆر زۆر بوو ..! لاشەم هاواری دەکردوو وام دەزانـی
نووکی بزمارەکان هەر لە ناو لاشەمدا ماوە ... لە پڕ دوو جەللادی بەعس ،
بەد خوو خۆیان کرد بە ژووردا و بانگیان کردم ، نەمتوانی وەڵامیان بدەمەوە ..
هەر کەسێکی تر بەو چەشنە منی ببینایە زیـڕەی دەکـرد .. ئەمجارەش
بانگیان کردم و چاویان بەستمەوەو بە ڕاکێشان بۆ جێگایەکی تر قەرەباڵغ و
چاویـان کردمـەوە !؟ نـەم دەزانـی ئـەو شـوێنە قەرەباڵغـە کوێیـە !! پـاش
ماوەیەکی زۆر هەستم کرد کە ناو زیندانەکەیە ، ئیتر وورده وورده بەرچاوم
ڕووناك دەبوو ، ئەو کات زیندانییەکانم ناسیەوە ئەو برادەرە زیندانییانە
دەهاتنە پێش و کەمێك تەماشای جەستەیان دەکـردم و ، هەندێکیشـیان
هەمان پرسیاریان لێ دەکردم ؟
هەمان پرسیاریان دووبارە دەکردەوە لێم ...
*لە دوێنێ شەوەوە وونیت ؟لە کوێ بوویت ، حاڵت چۆنە ؟!
-منیش توانای وەڵام دانەوەم نەبوو ، بەڵام بە ناسین هەموویانم دەناسیەوە
((کاك عبدول ڕەحمان) هاتو لەلام نزیك بووەوە و ووتی :- بۆ خۆت پشوو بدەو
وەڵامی کەسیش نەدەیتەوە ، ئازارت زۆرە دەزانم ، لە ڕاستیدا منیش ژیانم
لا تاڵ بوو .. پاش دوو سێ کات ژمێری تر دووبارە کاك (عبدول ڕەحمان)
لێی پرسیم :- حاڵت چۆنە ؟! وەڵامم دایەوەو .. پێم ووت ئەوەیە کە دەم بینی
؟! باشە ئەمجارەش ڕزگارت بوو لە کوشتن !((من لە دڵی خۆمدا ووتم نەماوە))
چونکە دوو ڕۆژە بردوویانیت ... ئیتر بە هیوای مانت نەمابووم کە جارێکی
تر بتبینمەوە !؟.. هەر باشە هەرئەوەش چاوەڕوان دەکرێ لەم فاشیستانەی

ڕژێمی جەللادی عێراق : کاك عبدول ڕەحمانی هاوڕێی زیندانی لێی پرسیم ووتی خۆ هیچیان پێ نەدرکانی ؟

منیش پێم ووت لەوبارەیەوە لەمن مەترسە ... ؟! تەنها جەستەم زۆر ئازار دراوەو برینم زۆرە لەشم دەڵێی جنراوە شتێك بڵێم لەوانەیە بڕوا نەکەیت ؟! کە بە چ شێوازێکی دڕندانە ئەشکەنجەیان داوم لەگەڵ ئەوەشدا باشم ئەوە نەبێ دەنا باری دەروونیم زۆر وورە بەرزترەو نەیانتوانی کە هیچ سوودێکم لێ وەربگرن ... لەوە باش دڵنیابە لەسەر ئامۆژگاریەکانی بەڕێزت و باوەڕوو وورەی بەرزی خۆم ، توانیم بەرگەی هەموو شێوە ئەشکەنجەدانەکانی ڕژێمی فاشی بکەم نەشتوانن تۆزقاڵێك ئەشکەنجەی ئەم جەللادانە کار لە بیرو باوەڕم بکات ، لە لایەکی ترەوە خۆ مرۆڤ هەروەك بەڕێزیشتان باوەڕتان وایە ، یەك جار دەمرێت و هەموو مرۆڤێکیش دەبێ بمرێ ، کەواتە بۆ بەسەربەرزیەوە ڕێگای مردن هەڵنەبژێرم بە پیرۆزی بۆ خاك و نەتەوەکەم بێت ...؟

لەوەتەی لێرەم ، ڕۆژی سێ جار زیاتر ، دەمرم و زیندوو دەبمەوە ..!؟

مرۆڤ هەندێك جار بیر لە هەندێك شت دەکاتەوە ، تەنها بۆ قازانج و گیرفانی خۆی لەسەر حسابی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی ، بەڵام ئەوەتەی لە زیندانم دەڵێم ژیان چی‌یە ؟!

بۆ چ دەبێ بژین ، ژیانێك کە سەراپای چەوسانەوەو زوڵم و زۆرداری بێت ؟!...

ئایا دەبێ ئێمە چی بێ وا بەم چەشنە دەمانچەو سێننەوە و نایەڵن لەسەر خاك و ئاوو نیشتمانی کوردستنانەکەمان وەك گەلانی تر کەبەچارەکی ئێمە نەخەباتیان کردوە نەپانتایی خاکەکەیان هێندەی ئێمە فراوان و پرپیتە و بە نرخە ؟! باشە ئێمەش خۆ مرۆڤین بۆ جیاوازیمان لەگەڵدا بکرێ وەك عەرەب و تورك و فارس ، بۆ دەبێ جیاوازی هەبێ ؟

گەر بە دیانەت بێت خۆ ئێمەش موسوڵمانین ، گەر بە زمانی ڕەسەنی نەتەوایەتی بێت ، ئێمەش خاوەنی مێژووی کۆنی خۆمانین و زمانی زگماکی زێدی باب و باپیرانیشمان هەر کوردەی بووە ؟
ئەی ئیتر ئایا جیاوازیمان چی‌یە ؟! ئایا ئەوانەی کە جەللادن و گەلێکی وەکو کورد دەچەوسێننەوە ، ئایا ئەوان خواوەند باشتر لە ئێمە دروستی کردوون ؟! ئەی بیر لەوە ناکەنەوە کە خواوەند هەموو مرۆڤێکی وەک یەک دروست کردووە ؟! ئێ باشە خۆمن خۆمم دروست نەکردووە ؟! ئەبێ گوناهی منێکی کورد و ئەوانی تر کە لە زیندان دان تەنها ئەوە بێ کە کوردین و بە کوردی زمانمان پژاوە چی بێت ؟!
یان دەبێ چاکەی ئەوان چی بێت کەبە عەرەب دروست بوون ؟! تۆ بڵێی خوا ئێمەی دروست کردبێ بۆ ئەوەی ئەم ڕەگەز پەرست و فاشیانەی بەعس ئازار و ئەشکەنجەمان بدەن ؟! ئەگەر واش بێت ، ئەی بۆ ئاژەڵ کە سەر ئەبڕی ، چەقۆی تیژی بۆ بە کار دەهێنرێت ؟! مەگەر بۆ ئەوەنی‌یە کە ئازاری کەمتر بێت .. ؟! بەڵام ئەمانە ، نرخی ئاژەڵیشمان بۆ دانانێن و بگرە بە شتێکی زۆر پیس و وەک قەرزیان بەلامانەوە بێت یان باوکیانمان کوشتبێت ، بۆیە ئاوا بە ئازارەوە دەیانەوێ نەمان هێڵن ؟! .

کێ بڵاوکراوەکانتان بۆ دەهێنێ ؟! چەند کەستان لە ناو شاری کەرکوک دا کوشتوە ؟! چەندجار پۆلی پێشمەرگەت لە ماڵی خۆت دا شاردوەتەوە ؟! بەرپرسیەکەتان لە شاری کەرکوک دا کێ‌یە ؟!...
یەکەیەکە بەبێ پێچ و پەنا وەڵاممان بدەرەوە ... گەر ڕاست کەی لە گەڵماندا ئەوا هەر ئێستا ئازادت دەکەین و بچۆرەوە بۆ ماڵی خۆت ؟! وە ئەگەر درۆش بکەیت لەگەڵمان و ئەو ڕاستی‌یانەمان پێ نەڵێیت ، ئەوا ئەوەی کە پێمان

وتیت ، هەر ئەوەیە ؟! وەحەز دەکەم باش بزانی چەندین زانیاریمان لایە بە بەڵگەوە ، بەڵام دەمانەوێ بزانین تۆ ئەو ڕاستی‌یانەمان پێ دەڵێی کە ئێمە دەیزانین ؟! چونکە ئەو هەڤاڵانەی کە پێکەوە کارتان کردووە ! هەموویان گیراون و هەموو زانیاری‌یەکیان داوینەتێ کە دانیان ناوە بەو کارانەدا ، کە ئەنجامتان داون ، وە لە سەر تۆش هەرچی ڕاستی‌یەك هەبێ ، هەڤاڵەکانی خۆت دانیان پێدا ناوەو گەواهیشیان لەسەر تۆ داوە ، خۆ ئەگەر ڕاستمان لەگەڵ نەکەی و درۆ بکەیت ئەوا زۆر ئاسایی ئەو برادەرانەی خۆت دێنین و بەرەو ڕووتان دەکەینەوە ؟! ئیدی باش تێ بگە ، دوا یئەم لێکۆڵینەوەیە هیچ شتێك دادت نادا .. ئەگەر سەلامەتی خۆت و ماڵ و منداڵەکەت دەوێ خۆت مەبە بە هۆکارێکی خراپ کە شێوازێکی ترت لەگەڵ دا بە کار بهێنین

*ئادەی خێرا وەڵامی ئەو پرسیارانەمان بدەرەوە ...؟!

ئێمەش واگوێت بۆ ڕادەگرین و دەینوسین .؟!

بەڵێ کەوتمە دەریای پڕ لە خەم و پەژارەوە ..!

...(مەحەمەد موراد) ((نازانم ڕای تۆ چی‌یە ؟! نازانم چۆن خۆت دەرباز دەکەیت ، ئیتر هیچی تر نەماوەتەوە ..؟ دەك گیانت دەربچێ ،ئەوە دەڵێی دەترسی ..! ئادەی پێم نالێی ژیان چی‌یە ؟! پاش ئەو هەموو سوکایەتی و ئەشکەنجەدانە ئەم بیرانە دەکەیتەوە ؟!

ئای ، خۆ وەك بڵێی دڕندەیی و کردەوە نامرۆڤانەکانی ئەو تاقمە خوێن ڕێژ و داگیرکەرەت لە بیر چوبێتەوە ؟!

چۆن دەبێ بۆ تەنیا ساتێکی کورت خایەنیش بێت ، لەبەردەم جەللادەکاندا وا لە خۆت بکەیت ، کە شێوەو ڕوخسارت بێ ئیرادەیی پێوە دیار بێ و ڕاڕایی بنوێنی ، ڕاڕایەك لە کردەوەی شۆڕشگێڕی ەو خەبات و تێکۆشان بۆسەر بڵندی نەتەوە بن دەستەکەمان ، ئەی لەبیرت چوو کە ئەم ڕژێمەو سەرانی گەورەترین کەنزیان دەست دەکەوێ‌و بە قەد باڵای خۆت پارە دەدەن

، تەنها شۆڕشگێڕێکی کورد بە شێوەیەکی وا ببینن کە چۆك دەدات بەرامبەر خواستە گڵاوەکانی خۆیان ؟!
هاوڕێی زیندانیم ، کەی ئەمانە مرۆڤ بوون ؟! تاوەکو کەسانی کورد پەروەرو خۆڕاگر وورەی نەمێنێو تەسلیم بەو جۆرە کەسانە بێت کە هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتیان نییە کەهەموو کردەوەیەکی دژ بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی بۆ خۆیان و دەستەو تاقمە خۆێن ڕێژەکەی خۆیان بە ڕەوا بزانن ، بەلام بۆ نەتەوەیەکی وەك کورد ، سادەترین مافیان پێ ڕەوا نەبینن ؟! ئادەی پێم ناڵێی کەی ڕەفتارێکی ساتە وەختیش چییە بۆ بڕوا بوونیان بە بوونی مرۆڤ و مرۆڤایەتی لەوەتەی هاتوونەتە سەر کورسی دەسەلات بینیوە بە پێچەوانەوە لە پێنا مانەوەی خۆیاندا تەڕو ووشکیان سووتاندووەو ، بەوە شەوە نەوەستاون ، هەر دەم لە هەوڵی شەڕەنگێزیدا بوون بۆ سەرکوت کردنی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی چ لە کوردستان دا و لە سەرانسەری عێراق دا نەگرتبێتە بەر ؟ خۆ ئەگەر ژنەکەم و خوشکەکانیشم لەبەرچاوی خۆم (.........) لێ بکەن چارەم چییە ؟! چون دەزانم ئەم ڕژێمە لە بنیادی شۆڤێنێتیدا لێدانی هەموو بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بە شێوەیەکی وەحشییانە مامەڵەی لەگەڵیاندا کردووەو دام دەزگای داپڵۆسینەکانیشی ، گەواهی ماهیەتی ئەم ڕژێمە دەسەلمێنێ ..وە دەبێ هەرچی کردەوەیەکی وەحشی گەرییانە هەیەلە لامان چاوەڕوان کراو بێت ..((خوشك و خێزانیشم وەك هەموو خوشك و خێزانێکی هەموو کورد پەروەرێکی شۆوڕشگێڕ دەبینم )).
کەی ئێمە خاوەنی شەرەفی خۆمانین لە ژێر چەپۆکی درندەترین ڕژێم لە جیهان دا ، کە ڕژێمی بەعسی فاشییە ؟! وەتا ئەم ڕژێمە بمێنێ و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی و سیخوڕەکانی هەمیشە ترسنۆکترین چەکی نامەردانەیان پێیە ، بەرامبەر کەسانێك کە ئیرادەی نەتەوەییان بۆتە میتۆدێکی

ئۆرشگێری درێژەیان بە سەخترین خەبات و گیانبازی خۆیان دەدەن ، هەر
ۆیە سەرانی ئەم ڕژێمەو جەللادەکانی باش لەو ڕاستی‌یە بەڵگە نەویستە تێ
ەیشتوون کە هەر کوردێکی بە بیروباوەرگەر لە ژێر سەخترین گوشاری
ەستەیی و دەروونی‌دا بێت ، دەزانن کە بەقەد تاڵە مویەك سوودیان لێ
ەرناگرن ، چونکە ناتوانن (پاکانە)بکەن لەسەر بیروباوەرێك ، کە بۆ ڕزگاری
سەربەخۆیی کوردستانە .. ئیدی چۆن ئەم ڕژێمە لە بن دەستەلاتی خۆیدا
پەنا بۆ شەرەف و کەرامەتی خۆشك و خێزانەکانمان نابەن ؟! بۆیە ، ئەم
ڕاستی‌یانەم پێ ووتی :ـ لە ڕۆژانی تری زیندانی خۆڕاگرتووتریەو هۆش
ێنەوەبەر خۆت و ئەوشتەی ئەوان باسیان کرد ، هەرگیز بۆ من نابێتە مایەی
سوکایەتی کردن ؟ سوکایەتی کردن لە ژێر دەستی جەللادەکانی بەعسدا ،
ئەوەیە کە من ناوی هەڤاڵەکانم بیلێم و خۆم بفرۆشم بە ڕژێمێك کە هەر چی
بەهای ئەخلاقی هەیە تیایدا نەك هەر بوونی‌نی‌یە ، بەڵکو گاڵتەشی پێ دێت
.. چونکە خۆیان و دەسەلاتە لەرزۆکەکەی بەعسیش هەرچی ئەخلاقێکی
مرۆڤایەتی بووە ، هەر لەسەرەتاوە ڕاست و چەپێکیان پێداناوە .. ئەوەی کە
هەمیشە پێوەی دەنازن ، بەد ڕەوشتی ئەم ڕژێمەو سەرانێتی ؟
بەڵێ ئەی هەڤاڵی نێو زیندانم ، دەزانی سووکایەتی بە لای ئێمەو خاوەن
ڕەوشتی شۆڕشگێری و ئازادی سەربەخۆییمان چی‌یە .. ؟! ئەوەیە کە دڵی
دوژمنی داگیرکەری پێ شاد بکەم و ناوی هەڤاڵەکانی ترم بلێم ..!! دەی
کەواتە ئەبێ لەو حاڵەتەدا شۆڕشگێری من و خۆڕاگری من لە کوێ دا بێت ،
دەی سوێندە بەرزەکەت بخۆ بۆ ئەوەی لانەدەیت لەسەر ئەو ڕێبازەی کە بە
خوێن تۆمارمان کردووە .. (سوێند بە خوێنی شەهیدان ، بە پەتی سێدارەی
دوژمن ، بەئەشکەنجەی نامرۆڤانەی نێو زیندان ، بە مەمکی بڕوای کیژانی
(١٤) ساڵ بە خاکی پیرۆز بەنەتەوە سەربڵندەکەم بە شیری مەمکی دایکم
....؟!هەرچی شێوەیەکی تر بگرنەبەر تەنیا لە پێناوی ئەوەی خۆم بفرۆشم

هەرگیزاو هەرگیز مەحاله گەر هەموو جەستەم قیمەکیش بکەن سوود لە من وەربگرن .. ؟!))

جەللادەکان لە ژووری زینـدان دا پێیـان ووتم :ــ نامەحەمــەد ئــەوەبۆ واقــت وڕماوە ؟ دەی ئیتر لەوە زیاتر لەسەرت ناوەستین .. دەی زووکە خۆتمان لێ مەکە بە گێلە پیاو وەلامـمان بـدەرەوە ؟! وەتـەنیا دوو رێگـات لەبەردەمـە .. خێراکە زوو قسەبکە و چیت کردووە پێمان بلـێ ؟... منیش جەستەم ببووە پۆلاو بۆ سەختیش ببوە بەرزترین چیای سەرکەشی کوردستانی داگیرکراوم ، وەلامم دانەوە :ــ بەلێ من بە هیچ شێوەیەك كەس ناناسم كە پێم دەلێـن ناوی هەڤالەکانت بلـێ وە نـە ئـەزانم کۆبوونـەوە چۆنـەو بلاوکراوەشـم هـەر نەدیوەو کەسیش لەو کەسانەی ئێوە ئەلێن ناناسم و بێگانەش رووی لە مالی من نەکردووە و ئێوە پێم دەلێن :. چەند کەست کوشتووە ؟ بەلام من هـەتا گەیشتوومەتە ئەم تەمەنەم زیانم بە پەپولەیەك چییە نەداوە ، ئیتر چ جای پیاو کوشتن ؟! چەندین جار پێم گووتوون کە من پیاوێکی هـەژارو کاسـبی مالی خۆمم ، ئەوەی ئێوەش باسی دەکەن من نیم و دوورم لەو تۆمەتانەی کە بەزۆری زۆرداری دەتانەوێ بەسەر منێکی هەژاردا بنێن !؟ ئەوەتا پێتان دەلێم هیچ نازانم زۆریش سەیرە لام کە ئەم قسانە بۆ من دەکەن .. کاتێکم زانی .. یەکێك لە گەورە بەرپرسەکانی جەللادەکان بە توندی وەلامی دامەوە بەلام چ وەلام دانەویەك ، کەوتە قسەی سووك و بێ سەرو بەرەو هەر خۆیان دەتوانن ئەو ووشانە بلێن ((چونکە پێگەی ئەم ڕژێمەو سەرانی لەسەر سوکایەتی وبێ شەرەفی دانرابوو)) .

هیچ شتێکی تری بەدەستەوە نەما ، نەڕاندی ووتی:ــ بیبەنە جێگای خۆی ...! بەلێ چاوومیان بە توندیشەتەك داو بردمیان بۆ جێگەیەکی تر ... کاتێك چاویان کردمەوە لە ژێر زەمینێکدا فڕەیان داوم بەلام ژێر زەمین پڕ بوو لە ئاو ، تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆمم کرد .. دووجەلاد ئەم سەرو ئەو سەریان لێ

گرتبووم و ئاگر لە چارەیان دەباری ؟! هەر ئەوەندەم زانی : ڕووتیان کردمەوەو هیچیان لەبەرمدا نەهێشت و هەر دوو دەستمیان لە پشتەوە بە توندی بەستەوەو فڕێیان دامە ناو ئاوی ژێر زەمینەکە ؟! وە دوو پشیلەی گەورە .. بەڵێ دوو پشیلەی گەورەیان هێنا بۆم ((دیارە ئەم جۆرە پشیلەیانەیان لەوەو پێش لەسەر شێوەی ئەشکەنجەدانی لەم چەشنە فێر کردبوو))؟! لەبەر ساردی ئاوەکەو ئازاری هەموو جەستەم هیچ جووڵەیەکم بۆ نەدەکرا بەوشەوە نەوەستان ئەو پشیلانەیان بەردایە گیانم ، بە چڕنوك و بە قەپ ، ((دەتووت ئەمانە پشیلە نین و لە پڵنگ دەچوون)) کەوتنە گیانم لەوکاتەدا کارەباکەیان کوژاندەوە ؟! پشیلەی بێ زمان چونکە نانی دەستی جەللادەکانیان خواردبوو ڕایان هێنابوون بۆ پەلاماردانی مرۆڤ ، بە شێوەیەك پەلاماریان دام کە ئازار و ئەشکەنجەی جەللادەکانم زۆر پێ خۆشتر بوو ... دەم دەزانی کات چەندە ، لەو ماوەیەدا هەموو گیانم بوو بە جێی چڕنوك و قەپی پشیلەکان ... لە ناو ئازارێکی زۆر .. بووراموەو لە هۆش خۆم چووم ..؟!

(وێنەی پشیلەکان)

هیچ هۆشم نەمابوو ... پاش ماوەیەکی زۆر کەمنیان بردبۆوە بۆ زیندانەکەی کەتیایدا زیندانی بووم ، بە چاوبەستراوی پەلامارو چرنوك و ئازاری پشیلەکان بۆ سەر دەم و چاوو جەستەم زۆر ئازاریان دابووم بە هەر حالّ وورده وورده .. دەهاتمەوە سەر خۆم بەلاّم گوێم لەدەنگە دەنگێکی زۆر بوو وەك خەون وابوو زۆر و کەم ئەو دەنگە دەهاتە گوێم و لە تاو نەڕەنەڕی جەللادەکان هاتمەوە هۆش خۆم ، پاشان زانیم کەئەمە زیندانەکەیە کە منیان هێناوەتەوە ئەوێ ... هەرچەندە هەر وام دەزانی پشیلەکان هەر خەریکی لاشەمن کاتێك چاویان کردمەوە هەستم بە دەورو بەر دەکردو هۆش بەبەرمدا هاتەوە ، بەلاّم زیندانی‌یەکان دەیان ووت :ـ (هەموویان دەورەیان داویت و بە تەمات نەمابووین ووتومانە کە لە ژێر ئەشکەنجەدانێکی زۆر سەخت دا گیانی لەدەست داوە)) بەلاّم بە لێدانی دڵم ووتیانە نەخێر نەمردووەو ماوە ! هەموو زندانی‌یەکان دەوریان دابووم و ڕاوەستابوون بە دیارمەوە ، ئەوکاتەی چاویان کرمەوەو هۆشیشم هاتبووە سەیرم کرد (کاك عبدول ڕەحمان) لەپشت سەرمەوە دانیشتووە ..!؟

پێی ووتم :ـ کاکە مەحەمەد گیان چۆنی براکەم منیش ووتم :ـ باشم کەمێك ئاوم بۆ پەیدا بکە بەڵێ کەمێ ئاوی دامێ وەك دەم تەڕکردنێك ! هەرچەندە زۆر تینووم بوو بەلاّم کەمە ئاوێکی پێدام ... ووتم کاك عبدول ڕەحمان زۆرە تینووە ! ووتی براکەم دەزانم بەلاّم ئێستاکە خراپە ئاو زۆر بخۆیتەوە ، ووت بۆچی خراپە ؟ ووتی براگیان تووشی ئاوسانت دەکات و هەردوو گورچیلەت دەوەستێ بۆیە واچاك ترە کەم کەمێ ئاو بخۆیت ... !؟ پێی ووتم :ـ برسیت نی‌یە هەرچەندە برسیمە بەلاّم جارێ هیچم بۆ ناخورێ باشە ئەوا سەمونەکەم بۆ داناوی ... نا ... نا ئێستا ناخۆم کەمێکی تر .. باشە بە ئارەزووی خۆت !! ئەگەر منیش نەبەن بۆ ئەشکەنجەدان ئەوا خۆم پێت ئەدەم وە ئەگەر بردمیان ئەوەتا لە ژوور سەری خۆتەوە بۆم داناویت و ئەوکات خۆت بیخۆ ؟! باشە

کاکە عبدول ڕەحمان ئەگەر توانیم باشە .. ئەو شەوە بەخت یاوەرم بوو چونکە کاك عبدول ڕەحمانیان نەبرد ... هەشت زیندانی تریان بردە دەرەوە بۆ ئەشکەنجەدان بەڵێ کات کەیشتە (١٠/٣٠) دەو سی دەقەی شەو کاك عبدول ڕەحمان پێی ووتم کاکە مەحەمەد گیان ئەتوانی سەموونەکەت بخۆیت ... نابرام ئارەزوو ناکەم گیانەکەم ئەگەر ئەتوانیت بیخۆیت چاکترە ؟! بڕوات هەبێ ناتوانم دەمم بەیەکدا بدەم ... ئاخر دوو ڕۆژە نان و ئاوت نەخواردووە ، ئەو تۆزە ئاوە نەبێ ؟!

*برای بەڕێزم دەمم ناکرێتەوە ئازارێکی زۆرم هەیە هەرچی گیانم هەیە پشیلە بە چڕنووك و قەپ دایان ڕزاندووە ؟!

-پشیلەی چی؟! خەون دەبینی ؟!

*نەخێر براکەم تۆسەیرێکی گیانی منت نەکردووە کاتێك سەیری کردم ئەو کاتە زانی کە حاڵم زۆر پەرێشانە ؟

-کاکە م.حەمەد نەمزانی بەو شێوە دڕندانەیە مامەڵەیان لەگەڵتا کردووە هەر ئێستا سەموونەکەت بۆ تەڕدەکەم و تۆیش زۆر لە خۆت بکە هەندێکی لێ بخۆ بـــا کـــەمێ هـــێزت بێتەوەبـــەر ئـــەگینا دەمـــری براخۆڕاگرەکـــەم !

*باشە باری گەورەم .. باش بوو هەندێك لەسەموونەکەم خواردوو هەندێك ئاوم خواردەوە ..کەمە کەمە کەوتمە قسەکردن ..

-کاك عبدول ڕەحمان وەك ڕۆژانی تری نێو زیندان و بە شێوازی خۆی کەوتە قسەکردن لەگـەڵماو کەوتـە پرسـیارو ووتووێـژ کـردن ... خـۆ هیچـت نەدرکاندووە ؟!

*نەخێر بەڵام باسی ژن و خۆشکانمیان لەگەڵدا کردوو ووتیان ئەگەر دان بەڕاستیەکاندا نەنێیت ئەوا ئەیان هێنین و لەبەرچاووی خۆت ...............

ئەزانی چی دەکەین ؟!

–هیچ ترست نەبێ تاوەکو ئێستا نەیان هێناون و تەنها بۆ ئەوەیە کە بترسێنن

.. نازانم بەبێ تۆ من چیم بکردایەو کێ دڵنەوای و دڵخۆشی بدامایەتەوە تۆ هەروەك فریشتەیەك لەم دۆزەخەدا زۆر ئامۆژگاریم دەکەیت و بە فریام دەکەوی بە ڕاستی زمانی سوپاسم نازانم چۆنی هەڵبێنمەوەو هەرچی بڵێم هەر کەمە لە ڕووی دڵسۆزتان .. ؟!

–نا ..نا کاکە مەحەمەد ئەو قسانە چیە دەیکەیت ئێمە برای یەکین و ئەی ئەگەر ئێمە پشتیوان و پەناو فریا گوزاری یەکتر نەبین ئەوا دوژمن پیلانە گڵاوەکانی دەتوانێ جێ بەجێ بکات .. بۆیە ئەوە ئەرکی سەرشانی ئێمەو هەموومانە دەبێ برابین و پشت و پەنای یەکتر بین و هیچ کەلێنێك لە نێوان ماندا نەهێڵین دەنا ڕزگارمان نابێ ؟! ئەگەر ڕزگاریشمان بێ زوو دەکەوینەوە نێو داوەوە .. هەر وەك پێم وتیت ئێمە براین و جارێکی تر حەز ناکەم وشەی سوپاس بەرامبەر ئەرکی سەرشانم بەمن بڵێیت و زۆر دڵگران دەبم چونکە (ئێمە برای یەکین زمان و ڕەگەزوو کەلەپوور خاك و ئاو و نیشتمانەکەشمان هەریەکە)

*ئیتر لەو کاتەوە وشەی سوپاسم بە کار نەدەهێنا ئەم شەو لە کاك عبدول ڕەحمانی هاوڕێم پرسی خۆ من هیچم بیرنەماوە چەند ڕۆژە چەند شەوە لێرەم.؟

–برام ئەمشەو حەوت شەوە تۆ لێرەیت

*بە دڵنیایی وایە ؟!

–بەڵێ !... ،

دواتر بە شێوازی قسەکردنەکانی کەوتە دڵدانەوەم و بەرزبوونەوەی وورەو خۆڕاگری زیاترم لەبەردەم شێوازە جۆراو جۆرەکانی جەللادەکانی بەعس دا .

کاك مەحەمەد((مرۆڤ تا لە ژیان دا بێت هەروەك چۆن تووشی خۆشی دێت هەر ئاواش ڕووبە ڕووی کارەساتە تراژیدی‌یەکانی ژیان دەبێتەوە وەك ئەمڕۆ کە تووشی زیندانی فاشی‌یەکان بووینەتەوەو ئەشکەنجەو ئازار بۆتە ساتێکی قێزەون دژ بە مرۆڤایەتی لەبەرامبەر گەلێکی چەوساوەی وەك کورد ئیتر ئەمە ڕۆژگارەو تیایدا دەژین هەرچەندە ئەشکەنجەدان و هەڵواسین و داپڵۆسین بۆتە خۆراکی هەمیشەیی جەستەمان بەڵام ڕۆژێك دەبێ ئازاد بکرێین و بکەوینە ژیانێك کە خۆمان چارەنووسی ئایندەی ئەم نەتەوەیەمان دیاری بکەین .

ئەی هاوڕێم چەند خۆشە پاش ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەدانە بە خۆڕاگری و سەربەرزی بمێنینەوەو پاش ئەوەی ئازاد دەکرێین هەموو هەڤاڵەکانت سەردانت دەکەن و دێنە دیەنیت و پێت پێ لەوە بە بەها ترە کاتی ئازادبوونت دەنگت دلێرو سەربڵندو سەرفرازیت کە لەبەردەم ئەشکەنجەی دڕندانەی فاشی‌یەکانی بەعس دا جوامێرانە خۆت ڕاگرتوەو هیچ زانیاریەکت نەدرکاندووەو بۆ دوژمن و بەڵێنی شۆڕشگێڕیت نەشکاندووە ئەمە ئەو پەڕی مایەی خۆش بەختی و تاجە گوڵینەی ڕێگای‌سەختی تێکۆشانت کردۆتە سەر چونکە ئەمە ئەو بڕوا بەهێزەیە کەلە سەری دەڕۆیت لە ژیانی تێکۆشان و خەباتی بەردەوام دا نەك هەر نەتوانرا ناوی هەڤاڵانت بدەیتە دوژمن بەڵکو بە ئیرادەیی نەتەوەیی خۆت دوژمنت سەرسام کردووە کەڕۆژانی زیندانی خۆڕاگریت ڕۆژێك دەبێ نەوەکانی ئێستاو داهاتوومان سوود و کەڵکی شۆڕشگێڕی لێ وەربگرن چونکە ژیانی زیندان بۆت دەبێتە وانەیەکی زیندوو کە خۆی لە خۆیدا (پەرتووکی ژیانە) ... ؟! وە ئەوەندەی تر بڕواو متمانە بە خۆت دەکەیت و دۆست و برادەرو هاوڕێکانیشت بڕوایەکی پتەویان پێت دەبێت و بە مرۆڤێکی خۆنەویست و خاوەن بڕواو ئیرادەیەکی بە هێز ناوت دەبێتە سەر وێردی زمانیان ... !

ڕەنگ بێ بە لای خۆتەوە ئەمە تەنها بە ئەشکەنجەو ئازاردانێکی بزانی بەڵام ئەمە خۆڕاگری و بەرخۆدانتە کە گەورەترین سەرکەوتن و شۆڕشگێڕی‌یە گەورەترین سەرمایەیە بۆ نەتەوەکەت هەر وەك پەندێکی ئینگلیزی دەڵێ ((ئازادی دەسەنرێت ، نادرێت)) وە هەر لە مێژەوە پێشینانیشمان ووتویانە : (( ئەوەی تاڵاوی ژەهر نەنۆشێ نازانێ ژەهر چی‌یە)) !

ئەوەی تاڵاوی ئەم ئەشکەنجەو قەسابخانەی جەللادەکانی ڕژێم نەزانێ و نەیچەشتبێ نازانێ ئازاری ئەشکەنجەدان چی‌یە ؟! وە هەر مرۆڤێکی خاوەن بیرو باوەڕی بەرزی ئازادی نەتەوەکەی بێ و قاڵبوونی کوانووی جۆش دانی خەبات و تێکۆشان و کاری ڕامیاری بێت هەر گیزاو هەرگیز دوژمنی داگیرکەر ناتوانێ تۆزقاڵێ کار بکاتە سەر وورەو تواناو خۆڕاگری ئەو مرۆڤە شۆڕشگێڕو بە هەڵوێستە .

چونکە بیرو باوەڕی ئەو مرۆڤە پاکتر و بەرزترو بە هێز ترە لە ئەشکەنجەو تۆقاندنی دووژمنی داگیرکەری خوێن ڕێژ هەربۆیە ئیرادەی نەتەوەبی بۆ هەموو مرۆڤێکی شۆڕشگێڕو ئازادی خواز دەبێتە ئەو فاکتەرە ئیجابیە کە بە مێشك بیر بکاتەوەو نەخشەش بۆ دوا ڕۆژی خۆی و ڕێکخراو نەتەوەکەشی دابڕێژێ کە ئەمە زۆر زۆر بە هێزترە لە ئەشکەنجەو ئازاری جەللادەکان چونکە لەو سەرچاوەیەوە هەڵقوڵاوە .. ؟! (من ئەوە دوو مانگە لێرە زیندانیم جگە لە هەڵواسین و ئەشکەنجەدانی جەستەیم هەرچی سووکایەتیەك بە شێوازی نامرۆڤانەی خۆیان درێغی‌یان لە تەکم دا نەکردووە هەرچەندە هەندێکی کەمم بۆ باس کردی لەسەر شێوازی ئەشکەنجەدانم بەڵام ئەشکەنجەدانێکی هێندە دڵڕەقانەیان لەگەڵمدا کردووە ئەگەر بە خەونیش ئەو مامەڵەم نامرۆڤانەم ببینایە ڕەنگ بوو تووشی نەخۆشی دەروونی و عەقڵی ببومایە ..

لەو ماوەی دوو مانگەدا کە هەر ڕۆژێکی بە مانگێك لێم نەدەڕۆیشت لەگەڵ ئەوەشدا نەك هەر نەیانتوانی تەنیا ووشەیەکم لێ دەربهێنن بەڵکو بە هۆی خۆڕاگری خۆم و بڕوا بوونم بە چارەنووسی سیاسی نەتەوەکەم من سەرجەم جەللادەکانم تووشی نەخۆشی دەروونی کردبوو کە بە سووکترین و دڕندەترین وەحشی خۆیان ببیننەوە کە لە هەموو بەهایەکی ئەخلاقی و پەیامی مرۆڤایەتی سەدان و هەزاران جار پاك نەبنەوەو نەتوانن لە خانەی مرۆڤایەتی‌دا جێگایان بێتەوەو لە نێو سەرەنوێلکی زبڵ خانەی مێژووی مرۆڤایەتی‌دا پەڵەیەکی ڕەشی پڕ لە تاوان کاریان بە تەوێڵی ناوچەوانیانەوە بێت .

لەگەڵ ئەم خۆڕاگریەش دا زۆر کەسیشم بینی کە پێش زیندانی کردنیان وا خۆیان نیشان ئەدا کە لەو پەڕی لوتکەی شۆڕشگێڕێتی‌دا قاڵ بوبێتن وگەر ڕۆژێك کەسێکیان زیندانی بکرێت ئەوا بەو پەڕی بڕواو باوەڕێکی نەگۆڕەوە بە هیچ شێوەیەك دوژمن نەتوانێ سوودیان لێ وەربگرێ .. بەڵام بە پێچەوانەوەی ئەوبیردۆزە شۆڕشگێڕی‌یەیان نەك دوومانگ لە ژێر ئەشکەنجە و هەڵواسین دا دان بە هەموو ئەو کاررانەدا بنێن کە کردوویانە بەڵکو هەر لەیەکەم شەوی ئەشکەنجەدانیاندا نەیانتوانی خۆڕاگرێتی خۆیان لەبەردەم دوژمنی سەرسەختی نەتەوەکەماندا بسەلمێنن بەڵکو تەنیا لە پێناوی مانەوەی خۆیانداو بەرگە نەگرتنیان دانیان ناوە بە هەموو کارێکی نهێنی زۆر جاریش لەبەر ئەوەی جەستەیان نەکەوێتە بەر ئەشکەنجەو لێدان و هەڵواسین ناوی خەڵکانێکی بێ ئاگاو هەژاریان داوە دوای لێکۆڵینەوەی بەدناوی جەللادەکان هەموو ئەو کەسانەیان دەستگیر کرد وە هەرچی سوکایەتیەك لەلایەن جلادەکانەوە بۆ ئەوکەسانەی (اعترافیان) کردبوو یەکەم پاداشتی دوژمن بەرامبەر ئەو جۆرە کەسە ئینتهازیانە ڕوو بەڕوو بوونەوەیان بوو بۆ بەردەم پەتی سێدارەو بۆ دواجار دەخنکان بەڵام لە سێدارەدانی ئەم جۆرە

کەسانە نەك هەر گەل ونەتەوەکەمان شانازیان پێوە ناکات بەڵکو بە کەسانێکی خۆفرۆش و دژ بە ڕەوتی شۆڕشگێڕانەی نەتەوەکەمانیان لەقەڵەم دەدا ..کە بە خۆیانەوە چەندین کەسی بێ ئاگا لە کاری (ڕێکخراوەیی)یشیان لەگەڵ خۆیاندا بەرەو پەتی سێدارە ڕاپێچ دەکرد ئیدی ئەوسا لە جاران زیاتر خۆڕاگرو ڕقی پیرۆزم ئەستوورتردەبوو کە نەك هەر ووشەیەك چی‌یە نەیڵێم بەڵکوو پەتی سێدارەو ئەشکەنجەدانم لابوە کارێکی ئاسان کە دوژمن بە ترسنۆکترین ڕژێم هانای بۆ شێوازی جۆراوجۆری ئەشکەنجەدان بە ڕێوە دەبرد ...

بەڵێ .. هەر بڕوا بەهێزەی خۆم بوو کە هەرگیز لە ئەشکەنجەدانی پەتی سێدارەی دوژمن بە سەربەرزی‌یەوە بمێننەوە .. ؟!

جا لەسەر ڕۆشنای ئەو دوومانگەی زیندانی زیاتر چەندین وانەی نوێی شۆڕشگێڕێتی فێربم و لەسەر جەستەی خۆم تاقی بکەمەوە مرۆڤ هەر کاتێك هەستی بە ئازارو چەوسانەوەی نەتەوەکەی کردوو ڕێگەی بەرخودانی شۆڕشگێڕانە گرتەبەر ئەوا پێویستی بەورەی پۆڵایین دەبێ‌و دەشبێ لە هەموو هەل و مەرجێکی دژوارو سەخت دا بەرامبەر دوژمن پشوو درێژ بێت چونکە ئەم مرۆڤە شۆڕشگێڕانە هەر گیز ناتوانن لە کاتێك دا هەست بە ئازارو ژانی نەتەوەکەی بکات بە ژێر دەستەیی لە نێو زیندان دا مانەوەی خۆی تەنها لاگرنگ بێت چونکە مرۆڤی خاوەن هەڵوێست و نیشتمان پەروەر ژیانی ژێر دەستەیی دوژمنی لەلا مردنە بۆیە بیرو باوەڕی کورد پەروەرانەی ڕاستەقینەی ڕێگەی پێ نادات کە ژیانی سەرشۆڕی پەسەند بکات منیش لەم وتووێژەدا ووتم :ـ بەڵێ پێویستە هەموو یەکێك لە ئێمەی کورد بەو جۆرە بڕوانینە ژیانی سیاسی و خۆڕاگریشمان لە چیا سەرکەشەکانی کوردستان پتەو تر بێت ، پێت وانی‌یە ئەو مرۆڤە سەربەخۆ خوازانەی نەتەوەکەمان بەم وورە بەرزە نیشتمانی‌یە بیر بکەنەوە ئەوا خۆری سەرفرازی یەك جارەکی بۆ

ئەم نەتەوە سەربڵندەمان هەڵدێت و ئەم نەتەوە چەوساوەو بن دەستەشمان بۆ هەمیشە ڕزگار دەبێت لە ژێر چەپۆکی دوژمنکارانەی ڕژێمی بەعسی عەرەبی لە عێراق دا گەر بیر لە مانەوەی ژێر دەستەیی بکەینەوە ئەوا تاوان نی‌یە جەستەمان خۆراکی خاك و نیشتمانی کوردستانە داگیر کراوەکەمان نەبێ ...! بەم شێوازی بیر کردنەویەش کە پێویستە لەسەر ئەرزی واقع بیسەلمێنین ئیدی ئەو کات بۆ نەتەوە بن دەست و داگیر کراوەکەمان بۆ کەس و کارو هەڤاڵان و خەڵکی چەوساوەی کورد ئەوانەی لە پەتی سێدارەی دوژمن بە هێزتر و بەرزتر بوون دەبنە سیمبوڵی ئازادی‌و ڕزگاری گەل و نەتەوەکەمان و هەمیشە بە نەمری و سەربەرزی دەمێننەوە ..؟ بەڵام مرۆڤی خۆ فرۆش و نەتەوە فرۆش جێگای نەفرەت و ڕسواکردن و ئابرو بردنە لە ناو بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستان و تەواوی کۆمەڵانی خەڵکی نیشتمان پەروەرو دڵسۆزی گەلەکەمان و تەنانەت ئاوو هەوای ئەم نیشتمانە داگیر کراوەیەی دابەش کراوەی کوردستان پێی حەرامەو وەك چڵکاو خۆرو خۆفرۆش و حەرام زادە سەیری دەکرێ جا (کاك عبدول ڕەحمانی) هاوڕێ بە هەڵوێستی زیندانیم :ـ کە مردنیش ئەرکێك بێت بە سەر هەمو کەسێکدا ئیدی بۆ بەسەر شۆڕی بمرێ و بۆ سەربەرز و نەمر نەبێت کە بۆ هەتا هەتایی ناوی هەڵوێست و جوامێری و خۆڕاگری نەبێتە وانەیەکی هەمیشە زیندوو لە ویژدانی هەموو کورد پەروەرێکداو ببێتە پێشەنگی خەبات و تێکۆشان و بڵێسەی شۆڕشی گەلەکەمان بە جۆشتر بکات وە ئەو پەیمان خۆشەویستی خاك و نەتەوەی کە دابووی بە کوردو کوردستان نەسڵەمینەوە ...ووشەی ناپاك ناخەمە سەر لاشەی جوان و پیرۆزم هەر بۆیە لاشەم پیرۆزە چونکە لە پێناوی دژ بە بەرژەوەندی‌یە ڕەشەکانی دوژمن درێغی نەکردووە بەڵکو لە پێناو بەرژەوەندی خاك و نەتەوەکەمدایە دڵنیاشم (ئازادکردنی خاك و نەتەوەکەم) مەرگی هەزارانی وەك مەحەمەد موراد و هەڤاڵانی لە وێنەی ئەوی گەرەکە بۆ

بۆ پەروا گیانم خەڵاتە ... وە پەیمانم سوێز و هەڵوێستی نەبەردی دووپات دەکەمەوە کە بە خوێنی پاکی شەهیدانی رێگای ئازادیو رزگاری و نەتەوەکەم ئەبێ خۆراگری بکەمە پیشەی خۆم تا دوا هەناسەش بەردەوام بم لە خەبات و شۆڕش لە پێناوی ئازادی و سەربەرزی نەتەوەکەمدا بم بۆ نوچ دان هیچ کات مل کەچی فەرمانی (دوژمنی داگیر کەر نەبم) تەنانەت شیری دایکم حەرام بێ ئەگەر خۆراگر نەبم بە خەم پەژارەو ئاواتی دوا رۆژو هیوای کوردستانێکی سەربەرزوو ئازاد نەبم ؟! کەوتنە رۆژی دوای و هەر چۆنێ بوو بە پێی کاتەکە .. بەڵێ وەك هەموو رۆژانی تری نێو زیندان سەمونێکی رەق و یەك تەماتەیان لەگەڵ کەرتێ خەیار ژەمەکانی خواردنمان بوو ... لەشم وەك خۆشە بوبێت و کەمتر هەستم بە ئازارو ئەشکەنجە دەکرد چونکە را هاتبووم ...

کات نزیك بوەوە لە (٩)ی شەو هەموو لە چاوەڕوانی ئەوەدا بووین کە ئێستا نا .. نا ئێستا خۆیان دەکەنەوە بە ژووردا و ناو دەخوێننەوە بۆ ئەشکەنجەدان هێندەمان نەزانی هەستکردنەکەم ڕاست دەرچوو بەڵێ خۆیان کرد بە ژووورداو جەللادێکی سەرو سیما ڕەش و کەللە زلێکی ناشرین بە چاوی‌دا هەستت دەکرد قینی لێ دەبارێ یەکسەر یەکەم کەس ناوی منی خوێندەوە ئەگەر ئەوە بەختی ڕزگارکردنم بوایە هەر گیز بۆ دەرنەدەچوو چاویان بەستمەوەو لە پشتەوە هەردوو دەستیان شەتەك کردم و بردمیان بۆ ژووری ئەشکەنجەدان لە ژوورەکەدا چاویان کردمەوە چی ببینم ڕووداوێکی سەیرو چاوەڕوان نەکراوم بینی !؟.. ڕوانیم وەك کوشتارگە هەر وەك چۆن لاکی مەڕو مالاتی سەربڕاو دەکەن بە پەتی قەنارەکانیا بینیم پێنج کەسیان گرتبوو کە تەمەنیان زۆر بچووك بوو لە نێوان (١٢-١٤)ساڵان دەبوون ؟! بەڵێ هاوارو نوزەی ئەو منداڵانە دنیای کاس کردبوو دڵی دوژمنی باوك کوژە بۆیان دەبوو بە کەباب وەك دەڵێن ؟! بەڵام خۆ خوانەکات ئەم جەللادانە بۆ

چرکەیەك چی‌یە بیر لەبەزەی بکەنەوە بەڵکو زیاتر ڕقیان ئەستورتر دەبوو کە تەنانەت منالآنیشمان بە تەواوی بنەبڕ بکەن هەر بۆیە بەم شێوە وەحشی گەریە کەوتوونەتە ویزەی منالّ و پیرو لاوی کورد ئەو منالّە بچووکە دوو پشیلەیان تێ بەردابوون هاواریان تەختی سەروەری دەهاژاند بڕوا بکەن چاو زۆر زالّمە گەر بتوانێ دیمەنی ئاوا جەرگ بڕ سەیر بکات ؟! ئاه .. کە دیمەنێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن بوو ، مرۆڤ گەر خۆی لەو جۆرە ئەشکەنجانەی نەدیتبێ ئەوا یەکسەر خۆی پێ ڕاناگیرێ و بێ هۆش دەبێت و دەکەوێت .سێ کەسەکەی تریان تەمنیان گەورە بوو نزیك بوو لە ٥٥تا ٦٠ساڵان هاوار و دادیان بوو کە ئەمانیش بەدەست پشیلەکانەوە کەتێیان بەردابوون سەرو چاویان دەکڕان و بەنینۆك کەوتبوونە جەستەیان ..؟

هەر باش بوو بەو تەمەنەوە دەیانتوانی هاواریش بکەن ... ئەم دەزانی چی‌لەوانە دەکەن و پلایس و گازیشیان بەدەستەوە بوو ؟! منیان ڕووبەڕوو ڕاوەستان بەرامبەریان .. ؟! ووتیان تەماشایان بکە !... ، هەردوو دەستمیان بە پشتمەوە بەستەوە پاشان هەردوو قاچمیان سەربەرەو ژوو کردەوەو سەرم بۆ خوارەوە هەڵیان واسیم !؟.. بە یارکوژەکانیان ووت (واتە ئەوانەی ئەشکەنجەی زیندانی‌یەکانیان دەکرد) دوای‌ئەوان نۆرەی ئەمە !!؟ بە جێیان هێشتم بەو چەشنە بانگیان لێ کردم سەیرکەو بزانە چی‌یان لێ دەکرێت دەرئەنجامی تۆش هەر وادەبێ و باشتر نابێ ؟!

سەیرم کرد ئەمانە زۆر نامرۆڤانەو لە وەحشی وەحشی تربوون زۆرم لە خۆم کرد کە بزانم چیان لێ دەکەن تەماشام کرد بە گاز وو پلایس خەریکی نینۆك دەرهێنانیانن لە دەست و قاچیان ؟! پێش ئەوەی نۆرەی من بێت تا بە گاز و پلایس تێم بەربن لەو پشیلانەی کە فێری ئەشکەنجەدانی مرۆڤ کراون دوو پشیلەیان هێناو تێیان بەردام کارێکیان بەسەرم هێنا هەر هیچ ئاگام لە خۆم نەماو بێ هۆش بووم ..؟!

پاش ماوەیەك !! هەستم دەكرد ئازارم هەیە بەلاّم نەمدەزانی ئازاری چی‌یەو لە كوێم وچیم بەسەر هاتووەو چی ڕووی داوە ؟! لە پڕ هەستم كرد ژوورەكە ڕووناك بوەوەو دەنگە دەنگ پەیدا بوو ؟!
نووكە شەقێكی مزر بەرسكم كەوت بەوە جوولاّمەوە؟ گوێم لیّ بوو ووتیان ماوە لە خوارمەوە ئەو سیّ كەسە بەتەمەنەكە بوون و هەر پێكەوە نووكە شەقێكیان دالەوان و ووتیان ئەمانەش نەمردوون بەلّیّ لەوان ڕەت بوون و گەیشتنە دوو مناڵەكەو یەكی نووكە شەقێكیشیان لەوان دا بەلاّم هاتە بەر گوێم كە ئەوان نەماون و مردوون هەستم دەكرد بە ڕاكێشان وەك شتێكی پیس ئەو دوو منداڵەیان بەڕاكێشان بردە دەرەوە بە ئێمەیان گوت هەر ئێستا نانتان بۆ دەهێنین ..؟! پاش ماوەیەكی زۆر كە لە دوو كات ژمێر نزیك بوەوە هەریەكە لەتە سەمونێكی ڕەق و خەیارێكیان بۆ هێناین و كەوتنە قسە كردن لەگەڵماندا ؟! ئێوە بۆچی خۆتان ڕزگار ناكەن ؟ئەمەكەی ژیانە ئەوەش بزانن لەمەش خراپتر هەیە ئەو كوڕانەتان بینی فڕێمان دانە دەرەوە ئێوەش چارەنووستان لەوانە باشتر نابێت تا زووە بیرێك لە خۆتان بكەنەوە ئەبیّ ئێوە چیتان لە دەست بیّ بۆچی هاوكاری ئێمە ناكەن وە بۆ خۆتان ئاسوودە بژین و لە هەر كوێیەك دەتانەویّ خۆشترین ژیان بەسەربەرن ؟! با ئەوەش بزانن ئەوەی هاوكاری تەواومان نەكات (فەرمانی سەرۆكایەتی شۆڕشە)چارەنووسی هەر ئەمانە ئیتر ئێوەش ئارەزووی خۆتانەو ئێمە زۆر لەكەس ناكەین بە ئارەزوو بێت باشترە ئیتر ئەوە لە دەستی خۆتان دایە واتە لەگەڵ ئێمە بن یا نەبن خۆتان هەڵی بژێرن ئێمە پیّ وتنمان لەسەرە ئێوەش بۆ خۆتان چی لە بەرژەوەندی خۆتان دەبینن وا بكەن ...؟! ئیتر پاش كەمێك

لەو قسانە کەوتنە قسەی سووك و ناشرین پێمان و چارەنووستان هەر ئەمانە ئەگەر وابیر بکەنەوە ؟! بیرێك لە خۆتان بکەنەوە دیارە ئەم ماڵەتان بە لاوە خۆشترە وانی یە بە تەوسێکەوە پێ ی ووتین ها ئیتر پێمان نەڵێن بۆچی پێتان نەوتین ئەوەی لەسەر ئێمە بوو پێمان ووتن ؟!

ئەوان ڕۆیشتن و دوو جەللادی تر هاتن ئەوخوێن وشتەی بەلەشمانەوە ووشك ببووەوە پاکیان کردەوە ئەمانیش وەك ئەوانی پێشوو هیچ درێغی یان نەکردوو کەوتنە قسەی سووك و نارەواو ناشرین پێمان ... هەر مەگەر لە زاری پیاو کوژەکانی بەعس بوەشێتەوە کە چەند شەریفن بەڵێ ئەوانیش ڕۆیشتن ئێوارە هات و هاتن چاوی منیان بەستەوەو بردمیان ؟! چەند کەسێك دانیشتوون هەروەك ڕۆژانی تر کەوتنە قسەکردن لەگەڵمدا لەوە دەچێ ئەم کابرایە زۆر بێ هۆش بێت (بێ عەقڵ بێت) !! ئەوە بۆچی ئەو زانیاریانەی دەیزانی پێمان ناڵێن و ڕزگارت بێت و بچیتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆت ئەوە تۆ بە هەموو بیری خۆت دەتەوێت ئێمە بخەڵەتێنیت ئادەی پێمان ناڵێی ئەو باوەڕە چی یە تۆ بۆخۆتت هێناوە کەس نی یە لێرە ڕزگاری بێت بە قسەی پوچ خۆ ئەگەر وابزانی لە پاش مانگێ و چەند پرسیارێك و نەچیتە ژێر باری هیچ ، ئیتر ڕزگارت دەبێ دەبا من پێت بڵێم سەخێر ئەوە خەیاڵی خاوە ئەگەر وا تێگەیشتووی ئەگەر ئەوەزانیاریانەی لات هەیە پێمان نەڵێی ئەو کاتە بە پیاو خراپ لە قەڵەمت دەدەین ئەو کات لە سێدارەشت دەدەین بەڵام ئەگەر وەك کەسێکی وولات خۆشەویست و ڕاستگۆ ئەو زانیاریانەی لاتە پێمان بڵێیت و هەموو نهێنی یەکان بدرکێنی ئەوە بەختی باش ڕوو لە ژیانت دەبێ و ژیانی ئاسوودە ڕوو دەکاتە خۆت و ماڵ و منداڵت وەلای ئێمەش ڕێزو پایەت دەبێت وە لە باشترین جێگا کارت دەدەینێ و باشترین مووچەشوەردەگریت لە کار کردن لەگەڵماندا بۆیە هیچ شتێکت پێ ناڵێین و بوارت دەدەینێ ؟!

بۆ ئەوەی تا دوو ڕۆژی تر ئەم کاتە بیری لێ بکەیتەوە و بە ڕیزەوە ژیانی خۆت هەڵبژێری ! و مێشکی خۆت ئارام بکەرەوە و بڕیاری خۆت وەربگرە ؟!
دوای پرسیارت لێ دەکەین ؟! بەڵێ هیچ پرسیارێکمان ئێستا لە تۆنییە وا ئازاد و سەربەست بۆ خۆت بیربکەرەوە ؟!
ئەمجارە ، ڕاستیان کرد ، گەڕانیمیانەوە بۆ ناو زیندانەکەو ناو زیندانیەکەیان ؟! ڕۆژی یەکەم بێ ترس ، لەگەڵ زیندانییەکانی تردا کەوتنە قسەکردن و قسەی زل زلم دەکرد .. ! (بە ئارەزووی دڵی خۆم ڕۆژی دوایی !! ئەمە دوا ڕۆژتە (حەمە موراد) ئیتر بکەرەوە ناو دیاری خەمی بێ بن بگەڕێ بە دوای چارەیەك ؟!
دەروازەیەك ڕێگا چارەیەك بۆ ڕزگار بوونت سەبەینێ ملت دەکەن بە پەتەوە ؟! ئەگەر خۆت نەفرۆشی بە پیاوکوژە عەرەبە بەعسییەکان لەبەر ئەوەی دوا قسەی خۆت لە گەڵ کراوە ئەوە دوا ڕۆژتە ؟ وەرە (حەمە موراد) هەموو سەروەریەك ژێر پێ بنێ و خۆت بفرۆشە ؟! لە پێناوی چی خۆت بە کوشت دەدەی ؟! لە پڕ تەزوویەك بە ناخم دا هات و وەك کارەبای زۆر ڕای چەڵەکاندم دەی گیانت دەربچێ ؟! ئەوە چییە بە خایاڵدا دێت و سڕت دەکات چۆن ڕێگە بە خۆت دەدەی خەیاڵی ئاوا تووشی پەژارەت بکات دوای ئەو هەموو ڕاستییانەی کە دەیزانی دەربارەی ئەم ڕژێمە خوێن خۆرو داگیر کەرەی‌نەتەوەکەت !!؟ تازە بە تازە بیر دەکەیتەوە ؟ یان ماوتە بڕیار بدەیت !!
ئاه چۆن ڕێ بە فیڕۆدانی خوێنی ئەو هەموو لاوو منداڵانەی نەتەوەکەت دەدەیت ؟! مێشتا نازانی لە پێناو چیدا گیانت بەخت دەکەیت ؟! خۆت تووشی ئازارو ئەشکەنجە کردووە !! هەر کە هۆشم کردەوە یەکەم ڕۆژ بڕیاری ناو ڕیزی شۆڕشم هەڵبژارد ؟دەمزانی گیانم خەڵاتەو پاداشتم دەبێ گیانم فیدای خەباتی نەتەوەو خاکم بێت ؟! هەریەك ڕۆژ دەمزانی ئازادی بە گیان و خەباتی درێژ خایەن و ئەسرەوتن دێتە دی ..!

له پێناو ئەو ڕێبازە پیرۆزە کە ڕزگار کەری مرۆڤایەتی‌یەو خزمەتی نەتەوەکەم دەکات چەند جار بیرت خەمەوە (هەی دەبەنگ) مردنی سەربەرزی خۆشترە لە ژیانی ژێر دەستی !؟ بۆیە وا دووبارە پەیمان تازە دەکەمەوە بە خوێنی شەهیدان بۆ کچانی مەمك بڕاو بۆ خاك و نەتەوەکەم ... لە پێناو بەرژەوەندی بەرزی نەتەوەم گیانم خەڵات و قۆچی قوربانی بێت لە پێناوی گەلەکەمدا و تا دوا هەناسەم کۆڵنەدەرو نەسرەوت بم پاش ئەوبیر کردنەوەیە وەك مرۆڤێکی زۆر ئازاد و سەربەست گیانم کەوتە خرۆش و وورەم زۆر زۆر بەرز بووەو سەراپای جیهانم بە ڕووناکی دەبینی ؟! وئیتر هیچ دڵە ڕاوکێ و ترسم لە گیانمانەما ! ئەشکەنجە و مردنم بە خەڵات دەبینی لە پێناو باوەڕی بەرز و پیرۆزدا .

دەبێ دوژمن بە ئاواتەوە سەربنێتەوە کە منی پەروەردەی خاکی خۆشەویستی (کوردایەتی) زانیاری یان نهێنی بدرکێنم هەروەکو شاعیر دەڵێ :.

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەبچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە
زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرنگەی زنجیر ئەئەم
سەیری ئەم زنجیرە کەن وەك پێوەنی شاهانەیە
بوکی ئازادیم ئەوێ خوێنم خەنەبێ بۆدەست وپێ
هەڵقە هەڵقەی پێوەنم بۆ پلپلەو لەرزانەیە
گەرچی دوژمن و ادەزانێ من بە دیلی لاڵ دەبم
باش بزانێ کونجی زیندانیم (قوتابی‌خانەیە)
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بەسەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عاملی ئازادی‌یە

تۆپ و شەشیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە

چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکا

میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە

چەکی شۆڕشگێڕی من ، نووسین و بیروباوەڕە

ڕاپەڕینە هەڵمەتە ، پڕ نەعرەتەی کوردانەیە

گەر بە ئازادی نەژیم ، مردن خەڵاتە بۆ لەشم

نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە

کوردم ئەمڕۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم

سەد هەزار لەعنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە

**********************************

هەر بۆیە ئێستا و هەزاران جار پەیمان تازەدەکەمەوە ، بەقەد کونی دەرزیەك خیانەت لە خۆم وولاتەکەم (نیشتمان) نەکەم ؟!

چونکە نیشتمان دایکمەو ئیتر چۆن دەبێ مرۆڤ خیانەت لە دایکی خۆی بکات ؟! کات دەڕۆیشت و کاتژمێر گەیشتە (٩,٣٠)ی شەو جەللادەکان دەرگاری زیندانەکەیان کردەوە ؟!

لە پڕ (محمد موراد) کە خۆمم بانگیان کرد و بە چاو بەسترایییەوە بردمیان بۆ پرسیار و لێکۆڵینەوە (بە گوتەی خۆیان).. واتە بەدەنگێکی ناسازورق وکینەو ؟! کەوتنە پرسیارکردن لێم !

*ئەم کاتەت، باش ئەبو جاسم ؟!

-سوپاس !

*قسەبکە ، عەرەبی نازانی ؟

-نەخێر؟!

*ووسبه چۆن عەرەبی نازانی و تۆ لە وڵاتێکی عەرەبی‌دا دەژیت ؟! بەڵام قەیناکە بۆ ئەوەی‌دڵنیات بکەین کە بەرت دەدەین و ئازاد و سەربەست بۆخۆت لە ناو شاردا بگەڕێیت و ژیانێکی خۆش بەسەر بەریت؟!
وە ئەوەش دەکەین و هەر چیت پێویست بێت ئامادەین بۆت جێ بەجێ بکەین ؟
تەنها وەکو پیاو و مرۆڤێکی دڵسۆز بە نیشتمان ناوی هەڤاڵەکانت و شانەکەتان و نهێنیەکانتان بۆمان باس بکە !! خۆت دەزانی ئێمە هیچ شتێکمان لێ وون نابێت ! و هەمووی لە ناوچاوی مێزەکەمدایە .
بەڵام خۆت باسی بکەیت چاکترە ؟! و بەڵێنت پێ دەدەین کە هیچ شتێکت پی ناڵێین و بەڵکو بە ئارەزووی دڵی خۆت دەبێ ؟!
-من کابرایەکی هەژار و بێ ئەملاو ئەولاو وە ڕەنگە ئێستا ماڵ و منداڵەکانم لە برساندا مردبن ؟ من بێ تاوانم ، هەژارم ، ئاگام لەو شتانە نی‌یە کە ئێوە باسی لێوە دەکەن ، هیچ جۆرە تاوانێك ، لە خۆم دا نابینم ؟
*دیارە (حەمەموراد) کۆتایی تەمەنت هاتووە ؟!
-وەك پێم ووتن من هیچ نیم و هیچم نەکردووە و بێ تاوانم ! بۆچی‌باوەڕ بە هیچ شتێك ناکەن؟ وە هەر دەبێ قسەی خۆتان بێت ؟
-ووسبە ! هەی بێ ئابروو .. خۆ ئەڵێی دەم درێژی دەکەی لەگەڵمان ..؟
ڕاوەستە هەر ئێستا چاوت پێ دەکەوێت ؟! وەچارەشت دەکەین ؟!
ئادەی ئەم زمان درێژو هیچ لەبارانەبووە بە پشتە ملە بکەنە دەرەوە ...دەی خێراکەن..؟!
ئیتر دەست بەجێ ، هەرئەوەندەم زانی چاومیان تونتر بەست بەڵام ئەم جارەیان وەهاچاویان بەستمەوە هێندەی نەمابوو خوێن لە چاوانم بترازێ .
جەللادەکان بردمیان بۆ جێگاکەیەك ؟! گوێم لێ بوو بە عەرەبی باسی پشیلەیان دەکرد..؟

تێگەیشتم کە دەیانەوێت پشیلەکانم تێبەربدەن ..! بە دڵنیای ئەشکەنجەدانی پشیلەکان زۆر زۆر ناخۆش تر بوو لەهەموو جۆرە ئەشکەنجەکانی تر ..!
بەڵێ دایان نام و دوو پشیلەیان هێنا ؟!...
(محمد موراد) قسەی ڕاستمان بۆ دەکەیت یاپشیلەت تێ بەربدەین ؟!
پاشان هەر چیت بەسەر بێت تاوانی خۆتە لەسەر خۆت !! لەوانەیەگەورەترین ئەشکەنجەت بدەین ؟! وا ئێمە پێمان ڕاسپاردیت !
لە دڵی خۆمدا ووتم دیارە من ئەوە چارەنووسەو بۆم براوەتەوە کە هەموو ڕۆژێ جۆرە ئەشکەنجەیەك بدرێم !!
لە ڕاستی دا پشیلەکانیان وا ڕاهێنابوو لە خۆیان زیاتر و دڕندەتربوون ؟ دڕندەی هەروا دەبێ ! و بەو شێوە دەبێت کە پشیلە ئەشکەنجەت بکات ، تا بۆ خۆیان وازت لێ نەهێنێ و ڕزگارت نابێ لە چنگیان واتا تاجووڵە لە لەشت تا هەبێ وازت لێ ناهێنێ !!
ئەوانیش بەم کردارانە قاقا پێ دەکەنێن جار ناجارێکیش دەیان ووت ها(حمە موراد) ئێستا چی دەڵێ ؟
ئایا دەبێ ڕۆژێك بێت ڕژێمی دژە مرۆییەکان ، ڕژێمی عەرەبی بەعسی صدامی نەمێنێت و نەتەوەکەم ڕزگاری بێت لە چەوسانەوە !؟
ئای کە چەند خۆش دەبوو کە نەمانی ئەم ڕژێمە دیکتاتۆری و خوێن خۆرە بە چاوی خۆمان بمان بینایەو کۆتایی پێ بهاتایە ؟
کەئەم خەون و خەیاڵێکی هەتاهەتایچم بوو بۆیە کەمتر هەستم بە ئازار دەکرد . کەی ئەو ڕۆژە بێت کەسەری پیاو کوژەکانی ئەم ڕژێمە بکەوتایەتە دەست گەل و دادگای گەل بکرانایەو یەکەیەکەیان بەسزای گەل و نەتەوە .. بکەن .. ئاهێکی خۆشیمان هەڵکێشایەو هەوای ئازادی و سەربەستمیان هەڵمژیایە .
وەك میللەتانی تری جیهان بمان ووتایە :ـ ئۆخەی لە ڕژێمی دژەمرۆڤی صدامی دیکتاتۆریەت ڕزگارمان بوو !!

ئەم بەسەرهاتەم وەکو ئەفسانە بڵاوکردبایەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو .. بەڵێ
پیاو کوژەکان . بەجێیان هێشتم و ئاگام لە خۆم نەما ولاشەی بریندار و
ساردوو سڕم کەوتە دەستی پشیلە و لەسەر زەوییەکە تەخت بوو بووم ؟!
لە ژێر زەمینەکەدا لە جێگای ئەشکەنجەی هەزاران هەزار مرۆڤی وەك منی بێ
تاوان و هەزاران هەزار کچ و منالی ٧و٨ سالان ! کە تەنها هەر لەبەر ئەوەی
کە کوردین و شانازی بە کوردبوونمانەوە دەکەین ...؟
بەڵێ : ئەشکەنجە دەکرێن و پیلانی دوژمن ـ ی دژ بە گەلەکەمان لە هەوڵی
بنەبڕکردنمان دایەو بۆ ساتێك چییە وازی لەو پیلانە دژە مرۆڤایەتییەی
خۆی نەهێناوە .
وە هیچ کاتێك دریغیان نەکردووە دژ بە خەڵکی کوردستان و هەموو
توانایەکی شۆڤێنستانەیان لەسەر گەلەکەمان تاقی کردۆتەوە .. بۆیە ڕژێمێك
ساڵەهای ساڵ ئەمە شێوازی مامەڵەکردنی بێت ..ئیتر ((کورد)) دڵی چیپێ
خۆش دەکات بەم درندە فاشییە .. وە بۆ بەرگرتن لەو سیاسەتە
نامرۆڤانەیەی ڕژێم دەبێ باواکان و دایکان ،ڕۆڵەکانی بە شێوەیەك پەروەردە
بکەن ، کە لە هیچ کاتێك دا پەنا نەبەنە بەر ناپاکی دژ بە نەتەوەکەیان بەڵکو
وەفا دارین بۆ نەتەوەو خاکەکەیان . وەهەر میللەتێك خاوەنی کیانی سیاسی
خۆی نەبێ و دەسەلاَت بە دەست خۆیەوە نەبێ ، چارەنووسێکی ڕەش
چاوەڕوانی دەکات ، وەتاکەکانی نەتەوەش وەك مرۆڤێکی خاوەن هەست و
کەسێتی و سەربەرز ناتوانێ بژی ! وە ئەگەر بیەوێ وەك هەر شێوازێکی
شوناسنامەی نەتەوەیی خۆی بناسێ ئەوا ئەگەر . خاوەنی ئیرادەو خیتابی
سیاسی خۆی نەبێ ناتوانێ لەگەڵ ڕەوتی گۆڕانی مێژوودا تەوەرەیەکی
سیاسی چارەنووس ساز بۆ خۆی دیاری بکات .
چونکە کیانی کوردی بە مانای خۆناسین و پاراستنی ئاسایشی نەتەوایەتی
و ڕیزبەندی گەلە ...!

زیندانیـەکانی تـر کاتـێ هۆشـم هـاتبۆوە پێیـان ووتم کـە بـە ڕاکێشـان هێناویانیتەوە بۆ بەردەم زیندانەکەو فڕێیان داوییتە ناوخۆمانەوە ؟
ئەو کات بێ ئاگابووم لە ژێر ئەشکەنجەداندان دا لە هۆش خۆم چوو بووم وەك لاشەیەکی بێ گیان ...؟!
کاتژمێر (١٠)ی سەرلەبەیانی بوو هەستم بە ئازارێکی زۆر دەکردو لـە تـاو ئازاری جەستەم نەمئەتوانی هەستمە سەرپێ و هاوار و ناڵەم لێوە دەهات .
وەك کەسێکی شێتم لێ هاتبوو تاوناتاوێك پشیلەکانم دەهاتـە بـەرچاوو کـە ئازاریان دەدام ئەم دیمەنەم دیمەنێکی هێندە ترسناك بوو کە مرۆڤی ئاسایی بەبینینی لە فلیمێك دا چاووی خۆی دەگرێ ..
زیندانی‌یەکان پێیان دەگووتم ئەوە چی‌یە کاکە (حەمە) ؟! لەبەر خۆمەوە
*دەم ووت (ئەو پشیلانەم لە کۆڵ کەنەوە)؟ واخواردمیان ... ئەوە
-دەلێی چی کاکەحەمە (پشیلەی چی) برای ئازیزمان ؟!
*ئەو پشیلانەم لە کۆڵ کەنەوە تکاتان لێ دەکەم ... واگیانمیان هەنجن هەنجن کرد ..!!
-ئیدی زیندانی‌یـەکان تێگەیشتن کە ئازارێکی زۆر دراووم بۆیـە تانەوپـەڕی هاوکاری و هێنانەوەی باری دەروونیم بۆ باری ئاسایی خۆی هاوکاریان کرد، زۆر لەسەر خۆ بە هێمنی پێیان ووتم (بە قوربان هیچ لە دەورت نی‌یە پشیلەت لەدەور نی‌یە) بڕوا بکە ... ئەوە ئێمەت لەگەڵێن لە زینداندایـن ... ئەو کات بیرم کردەوە (کە ئێستا لە کوێم و هێنراومەتەوە ناو زیندانەکە) ؟!
*ووتیان هیچ لە دەورت نی‌یە برای ئازیزمان وە ئەوانیش دوانیان هاتبوونە ژێر باڵم ،تا خوێنە قەشیەکان بکەونەوە جوڵە .
-ئەوکات زانیـم کە بەتـەواوەتی لـە زینـدانـدام پێـم ووتـن هیـچ نـەبوو خـەو، دەبینی و بم بوورن .. تکا دەکەم ؟!
پاش ماوەیەکی کورت یەکێ لە هەرە دۆستەکانی ناو زیندانی‌یەکان

*پرسیاری لێ کردم کاك محمد حاڵت چۆنە ؟...

-زۆر باشم کاکە گیان ؟!

*ئەوە ڕاست بوو خەوت بینی یان بە ڕاستی پشیلەیان تێ بەردابوویت ؟

-بە خوا خەون نەبوو بەڵام باخەون بێت (ئەشکەنجەی دوێنێ شەوم چەند پشیلەیەك بوو ئیتر نازانم کەی بووراومەتەوەو کەی پشیلە وازی لێ هێناوم چۆنیان هێناومەتەوە ئێرە بۆیە ئێستاش ئیتر نازانم ئاگام لە خۆم نەما کەی لەناو ئەشکەنجەو ئازار و پەلامار دانی پشیلەکان بۆسەر گیانم کەی لە هۆش خۆم چووبووم .. وە ناشزانم چۆن منیان هێنایەوە بۆ ئێرە ... بۆیە ئێستاش پشیلەکان لەبەرچاومن کە چۆن ئازاریان دەدام ... کەم کەمە کەوتمە قسەکردن لەگەڵ زیندانی‌یەکان کە ئەم ماوەیە پێکەوە زیندانی بووین پێکەوە پیاو کوژەکانی عەرەبی بەعسی زۆر بێ بەزەییانەو بە دڕندانەترین شێوە ئەشکەنجەیان دەداین ..؟!

بە هەمو جۆرەکانی دەزگای ئەشکەنجەدان و تۆقاندن کەلەبەردەستیاندا بوو فێرکرابوون لەسەری ئەشکەنجەیان دەداین بێ بەزەییانە و دڕندانە ئاسا ... چێژیان لە ئازاری‌مرۆڤ وەردەگرت ..؟! نیوەڕۆ نزیك بوەوە .. سەمونێکی ڕەق و یەك تەماتەیان بۆ هەریەکێ پێداین ؟! زۆر برسیم بوو ؟! دوو ڕۆژێك دەبوو نانم نەخواردبوو؟ وەزۆریش ئازارم هەبوو توانای دانیشتنم نەبوو ئارامم لێ هەڵگیرابوو لەبەر ئازار !! ئێوارە هاتن و وتیان ئەمشەو هەمووتان بخەون و کارمان بە کەستانەوە نی‌یە ؟! منیش لەبەر خۆمەوە وتم (دیارە نیازێکیان پێمان هەیە وەیان شتێك بووە ؟! چونکە ئەم خوێن خۆرانە وا پەروەردە کراون کە بەتوندترین شێوە ئازاری مرۆڤ بدەن وتەنانەت ناوتوانن پشوو بە خۆشیان بدەن) .

چۆن ئەم جەللادانەی بەعس تام وچێژێکی سادیزمی وەردەگرن لە ئازاردانی خەڵکی نیشتمان پەروەرو مرۆڤ دۆست و گەشەی پێ دەکەن بەو

ئازاردانەیان .. لە مێژووی کوردا باسی کابرایەکی خوێن خۆر ئەکرێت بە ناوی (زوحاك) کە دەڵێن مار بە سەر شانەکانیەوە بوەو هەر ڕۆژێك خوێنی دوو لاویان داوە بە مارەکانی ..بەڵام ئەم (صدام) و ڕژێمە عەرەبی بەعسی‌یە هەریەکەیان مارێکن لەو جۆرە جا تاوەکو گەل کورد یەك ڕیز و یەك هەڵوێستی شۆڕشگێڕی نەبێ ئەوا ناتوانن سەرکەوتن و سەرفرازی یەکجارەکی لەدەست بهێنن بە پێچەوانەشەوە هەر ڕۆژێك گەل کورد بە هەموو چین و توێژەکانی‌یەوە ڕیزەکانی خۆیان یەکخستن و بۆ یەك ئامانجی سەرەکی تێکۆشان ئەوا ئەو ڕۆژەش دێتە دی کە وەك کاوەی ئاسنگەر هەر یەکەمان کاوەیەك بین بۆ پانکردنەوەی سەری جەللادەکانی ڕژێمی بەعس و ئەو کاتەش خۆری ئازادی یەکجارەکی لەدەم کەل چیا سەرکەشەکانی کوردستانەوە هەڵدێت ...؟! کاتژمێر بوو بە (١٠)ی شەو بەمنەوە حەوت کەسیان لە زیندانی‌یەکان بانگ کردە دەرەوە ...

*پێیان وتین بۆ سەیر کردن بانگتان دەکەین مەترسن هیچ ئەشکەنجە نادرێن ؟!

دیمەنی ئەشکەنجەدانەکە :.

دەی راستیەکان بڵێ ئەگینا هەر ئێستا لە گیانت دەکەین گوایە تۆ دەتەوێت لە ئێمە رزگارت ببێ ؟! و بەو هیچ نەووتنەت ئیتر وازت لێ بهێنین ،ئەوا خەیاڵت خاوە ؟

بەڵێ تێ گەیشتم کە بۆیە ئێمەیان بانگ کردوە بۆ ئەوەی دیمەنی ئەشکەنجەدانی مرۆڤی بێ تاوانی تر ببینین ؟!

تاوەکو وورەمان بڕوخێ وترس بخەنە دڵمان ...؟

دیمەنەکەش، دیمەنی ئەشکەنجەدانی کچە کوردێکی شۆخە ؟!

کەوتۆتە بەر پەلامارو هێرشی ئەم دڕندە بێ بەزییانە ؟!

ئەوان داوای لێ دەکەن  کە راستی یەکان بدرکێنێ وکچەش هیچ نالێ ..ئەو کچە کوردە شۆڕشگێڕە تەمەنی (١٦)سالآن بوو ناوی (ئارەزووە)وخەڵکی گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك بوو .

دەی بڵێ و قسە بکە ... هەردەبێ پێمان بڵێیت تۆ لەگەڵ کێ کاردەکەیت ؟

ئێمەشیان بۆیە پیشان دەدا تاکچە کە زیاتر بترسێ و هەموو شتێك بدرکێنێ؟

(وێنەی ئارەزوو)

له وه‌لامی کچه شۆڕگێڕدا :من کچم و دوای خوێندنگا له ماڵی خۆمان ناچمه دەرەوە ، ئیتر کاری چی و کێ ی چی ؟! من بێ تاوانم وهەژارم ...جگەلەوەی کەکوردم هیچ شتێکی تر نیم ؟! خۆنەگەر لەسەر ئەوەش گیراوم ،ئەوا ڕاستە کوردم و مەرگیش ناتوانێ لە کورد بوونم جیام بکاتەوە ؟!

پاش دوو سەعات تەماشاکردنی ئەودیمەنی ئەشکەنجەدانەو بەوشێوە دڕندانەی ... خۆیان کە هەردەبێ ئەمانە ناویان دڕندە بێت ،کە خۆیان دەیزانن.؟!..

وازیان لە وشۆخە تازە هەڵکەوتووە کچە بەوەفاو خۆڕاگرو بەهێزەی کورد هێناو ئێمەشیان گێڕایەوە بۆ ناو زیندانەکە ...

لە گەڕانەوەماندا پێیان ووتین ئەگەر ئێوەش ڕاستی یەکان نەڵێن بەو شێوە یە کچ و خوشك وژن وکەس وکارتان دەهێنین بۆ ژێر ئەشکەنجە ؟! کابرای جەللاد دەستێکی بە سمێڵیدا هێناو وەك بڵێی نێچیریان دەسکەوتبێ ووتی ئەوەش چارەنووسی ژن وکچ و کەس وکاری ئێوە دەبێ ؟!

دیمەنی لەوجۆرە ، زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێم مردن زۆر زۆر خۆشترە ،زۆر لەو هەموو ئەشکەنجانەی کە کرابووم ئازارم زیاتر پێ‌دەگەیشت ؟!

بەڵام لە هەمان کات دا ئەودیمەنی خۆراگری وبەهێزەیی ئەو کچە قارەمان وسەربەرزەی نەتەوەکەم ،وورەیەکی بەرزو وورەیەکی بەجۆشتری پێ بەخشیم ...

ئافەرین ڕۆڵە کە شیری دایکی بەپاکی خواردوە کورد کچی شۆڕشگێڕی وەك ئەم کچە شۆڕشگێڕەشی پەروەردە کردووە ..کەبۆ چرکەیەك چۆك دانەدات.. چۆن ، چۆن بەو پەڕی ڕەوشتێکی بەرزوو وورەیەکی شۆڕشگێڕانەوە بەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەدانەشەوە . توانی بەرپەرچی جەللادەکان بداتەوە جارێکی تر لە بەردەم ئەو خوێن ڕێژانە ، چۆن ناوی کوردی وەك ئەڵماس دەکردەوە بە ناخی دەروونیانداو ئەوانیش هەرچەندە زیاتر

ئەشکەنجەکەیان توند تر دەکرد لەسەری بەلام بێ سوود بوو ئەو هەموو ئەشکەنجەدانەی ئەو کچە کوردە شۆڕشگێڕە زیاتر ئیرادەی نەتەوەیی بەرزتر دەبوو .. کچە کوردێك لە زیندانی فاشی‌یەکانی بەعس دا بەم شێوەیە بتوانێ بەرگری لە کورد بوونی خۆی بکات و کەرکوك بە موڵکی کوردان بزانێ ، شایستەی ئەوەیە کە هەمو کوردێك بەو شێوە بیرکردنەوە کوردانەیە پارێزگاری لە کوردستانە داگیرکراوەکەیان بکەن وەدەبێ دوژمنە داگیرکەرەکان خەونی پێوە ببینن کە بە هێزوو ئەشکەنجە ئیرادەی نەتەوەیی کورد پەروەرانە ڕیشە کێش بکەن .. کە خەونی پێوە دەبینن ؟! ڕووردەکەنەوە حمە موراد و پێی دەڵێت... ئادەی بیبەستنەوەو ئەوەی بڕیارمان داوە ئەنجامی بدەن ؟! چی دەڵێی بیڵێ ؟ هەر ئەوەیە کە پێم ووتی !

–چارت دەکەین ئێستا ..!؟

((من هیچ چارەیەکم نی‌یەو خۆتان خاوەنی دەسەڵاتن ؟! هەرچی بکەن ئەتوانن ؟! ئێمەی بێ دەسەلات و ژێر دەستەی ئێوەین ، ئەی خۆتان خاوەنی دەسەلات نین !

یاسای دەوڵەت بە دەستی ئێوە نی‌یە ؟ کورت و درێژ ؟! چی ئارەزوو بکەن دەیکەن و کردووتانە)) ..؟!

–ئەوە هەی ...... ئەوە چیت ووت ؟! چی ... چی دەی بڵێ ..! هیچم نەووتوە وەگوێم بۆ ووشەکانی ئێوە ڕاگرتووە ؟! ئادەی دووبارەی بکەرەوە ... چیت ووت ؟! ها ... بە ڕابواردنێکەوە جەللادەکەی کە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەشم دەدا ، پێی ووتم :- دیارە تۆ تۆی نائینسان بەو قسە پڕوپووچانەت دەتەوێ بە ئێمە بڵێی چی .. !

دەتەوێ بە ئێمەی بسەلمێنی بێ تاوانی (بە پێکەنینێکی شێتانەوە) کەوەك ناخۆشترین دەنگ لەسەر زەوی گوێم کپ بوو .. لە تاو ئەو دەنگە ناقۆڵایە ... وئێمە کاری ناڕەوامان کردووە لەگەڵ تۆ !؟ ئادەی ووت چی ؟! ئەو قسەیە

چیبوو .. دووبارەی بکەرەوە بۆمان ؟! هیچم نەوتووە ووتم بە ئارەزووی خۆتانە -باشە حەمە مەگەر ئەم قسەو شتانەت هەروها بە ئاسانی بەسەرتەوە بڕوات ؟! منم ئێستا لەبەردەمی ئێوەدا هیچ توانایەکیشم نییە زۆر بێ تاوتری کەش هەن وەك من جگە لەم هیچی ترم نەووتوە کە بێ تاوانم ؟!

-هەم وادیارە خۆت بە بێ تاوان دەزانی ؟!

*من هیچم نەوتووە .. ئەگەر خۆتان چی ئەمر بکەن هەر ئەوە دەبێ !

– ئادەی وادیارە لەگەڵ ئەم هیچ و پووچەدا قسەکردن سوودی نییە بیبەن بۆ جێگا تازەکەی ؟! ئەوەی بڕیارە وا بکەن ؟!

((بەڵێ هێنامیانە دەرەوە بە چاو بەستراویی بەرەو جێگای دیاری کراوی خۆیان ؟! ((دیار بوو نیازی ئەشکەنجەیەکی زۆر بێ بەزییانەیان هەبوو لەگەڵم دا)) ووتیان (حەمە) تاکو دەستمان نەکردووە بە ئەشکەنجەو ئازاردانت ؟! چەند ناوێکمان پێ بڵێ ئەتوانی بەڵێنمان پێ بدەیت و قسە بکەیت ئێمەش خاوەنی بەڵێنی خۆمانین کە هیچ ئازارت نادەین ؟!

*منیش ووتم .. باوەڕ بکەن (من بێ تاوانم)

-وەرە (حەمە) وادیارە ئیسفادەی نییە ئێستا دەت بەستینەوەو هەموو نینۆکەکانت دەردەهێنین ؟!

ئەگەر دان نەنێی بە هەموو شتێك دا جادان بە تاوانەکانی خۆتا بنێی چاکترە ؟! *ئەوا ئارەزووی خۆتانەو بەردەوام بن لە کاری خۆتان ، بەلام هێندە دەڵێم :ـ کە من بێ تاوانم ؟! بێ تاوانم ...

لەبەر خۆمەوە لە دڵی خۆمدا دەم ووت (دیارە خزمەت کردن بە مرۆڤ ئەمەیە لای ئێوە ئەی کوا مافی مرۆڤەکەی ئێوە ، کە هەر بۆ چاوبەستەکی باسی لێوە دەکەن و کە جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤی جیهانیش دا ئیمزاتان کردووە ؟نا .نا ئەبی ئیمزای ئەوەتان کردبێ کە دژی مافەکانی مرۆڤن دەنا

بەو جۆرە مرۆڤتان بەو جۆرە لێ نەدەکرد ، مرۆڤ لای ئێوە لە هەموو شتێك بێ نرخ ترەو ئەو قسەو دەنگ و باسانەتان هەر بۆ چاوبەستکیو بەخەڵك و رای جیهانی ؟! ئەگینا چۆن ئاه و ناڵەی مرۆڤی بێ تاوان بە تایبەتی منداڵان ..! چۆن کەڕوو لاڵ و ئیفلیج نابن ! ئەگەر ویژدانتان هەبووایە چۆن ئازاری نەئەدان ؟!

چۆن بیر دەکەنەوە ؟ خۆتان ناو دەنێن چی ؟!)

لە بیر خۆمەوە دەم ووت چاکتر وایە هەندێك قسەیان پێ بڵێم بەڵکوو بە هێندەی هەر هیچ نەبێ ئازاری خۆم یا ئەوەی لە دەستم دێ تۆڵەیان لێ بکەمەوەو ئازاری دەروونیان بدەم و ئەوان هەر ئازارم ئەدەن هەر بۆ ئەوەش کە دڵنیا بن لەوەی کە من بە هیچ یان نازنم و ئازارو ئەشکەنجەیان کار لە من ناکات !!یەك تۆزقاڵ ؟!

(وێنەی دەرهێنانی نینۆك)

بەڵكوو وورەم ، باوەڕم هێندەیتر بەرزتر دەبێ لەدڵی خۆمدا بە خۆمم ووت (دەك بتۆقێی (حەمە) ئەوە چیتە ، چەند ڕۆژە تۆ لە ژێر ئەشكەنجەو لێدان ، دەك خوای دەكرد لە جێگای نینۆك چاوەكانیان دەر دەهێنایین ؟! پیاو یەك جار دەمرێ) ئیتر هەر خەریكی خۆ بەهێزكردن بووم و وورەم دەدایە بەر خۆم ، ئەوانیش بێ گوێدانە هیچ یاساو ڕێسایەك دەستیان كرد بەدەرهێنانی نینۆكەكانم .. تاوكو سێ نینۆكیان دەر هێنام ئاگام لە خۆم بوو ..! ئیتر چیان كردووە كردوویانە !... كاتێكیش هۆشم هاتە بەر خۆم : دیار بوو هێنابوومیانەتەوە بۆ ناو زیندانیەكانی دیكە ...

هەر بۆ چاو شكاندن و تۆقاندنی زیندانیەكانی تر ئەم جارەش وەك ڕۆژانی تری ئەشكەنجەدانم بە ڕاكێشان هێنابوومیانەوە بۆ ناو زیندانیەكان كە هەر هەمووی چاریان لێی بووە لە ئەشكەنجەدانم ؟

تا دوو ڕۆژ هیچ نانم پێ نەدەخورا !! پاشان كەوتمە ئاخافتن و ئیشتهایی خواردنم كرایەوە ... هێدی ... هێدی كەوتمەوە چاك بوون دەڕۆشتم ... لە ناخی خۆمدا دەم ووت:ـ (( دیارە مەرگ لە من دەترسێ دەنا دەبوو پاش چەندین ئەشكەنجەی نامرۆڤانەی جەللادەكان هێندە دڕندانە بوو مەگەر كەسێك خاوەنی ئیرادەی نەتەوەیی خۆی نەبووبێ و لە ژێر ئازاردان دا قسەی بۆ جەللادەكان كردبێ بە هەموو ئازاروو ئەشكەنجەو هەڵواسین و سەخترین كردەوەی نامرۆڤانەیان دەبوو بمردبمایە پێشینانمان زۆر جار بۆ كەسێكی خۆ ڕاگر و نەبەردوو پۆلا ئاسا پێیان ووتووە هەر دەڵێی پشیلەی حەوت ڕۆحە بەلام بە پێی ئەو ئازاروو ئەشكەنجەو هەڵواسین و كردەوەی وەحشی گەری بەرامبەر بەو هەموو ئازاری شێوازی بەدەر لە بەها مرۆڤایەتی خۆمم ڕاگرت و هیچ ووشەیەكم بۆ جەللادەكانی بەعس نەهێنایەوە بۆیە پێم وایە من دوو ئەوەندەی ئەو گیان لەبەرەی كە حەوت ڕۆحی هەیە و پشیلەیە دوو ئەوەندەی ئەو بووم ((مرۆڤی شۆڕشگێڕ و نیشتمان پەروەر ئیرادەو هەستی

نەتەوایەتی کوردانەی لە چڵە پۆپەدا بێت ، نە بە دەرمێنانی نینۆك نیـیە وە ئازارو ئەشکەنجەیەکی دوور لە هەموو بنەما ئینسانی‌یەکانی کـە لـە کـاتی ئەشـکەنجەو هەڵواسـین و ئـازار دانـدان دا هیـچ کـاتێك بـە دڕندەتریـن ئەشکەنجەی بەعسی عەرەبی فاشی (بەغداد) : نـەك هـەر بیرو بـاوەڕم پـێ نادرکێنن بەڵکو لەلای مرۆڤە شۆڕشگێڕەکانمان کە بۆ سەرفرازی گەلەکەمان ژیانیان لە ناو لەپی دەستی‌یان دایەو بێ باکن بەرامبەر هەموو شێوازێکی دڕندانەی ڕژێمی بەعسی فاشی ووشـەیەك لـە قـازانجی جەللادەکانی تێدا ببێت ئەوا چەندێ ئازارت زۆر دەبی بەڵام دوو ئەوەندە ڕق ئەستوورتر دەبێت وەك تۆ یاری بە ئایدۆلۆژیای خۆتان و کەسانی بێ دیفاع خۆیان ئەنجامی ئەدەن ... دەنا هەر مرۆڤێکی شۆڕشگێڕێك چونکە پەروەردە کراوەو هەست بە لێپرسینەوە ئەگەر سەخترین ئەشکەنجەی بدەن نەك ئازار دانی داپڵۆسین و ئەشکەنجەی ڕۆژانە ئەو بیرو باوەڕە کورد پەروەرانـەی ڕق ئەستوور تـر ئەکات بەرزوو پیرۆزی مێرخاسە ... ئەبـەزەکانی نەتـەوەکانمان نابینـێ ... بەڵکو زەبرو زەنگی ئەشکەنجەدان بیری شۆڕشـگێڕانەت فـراوان تـر دەکـا و ناپسـێنێ بـەڵکو زەبـرو زەنـگ و ئەشـکەنجەدانی فاشـی‌یەکانی بـەغدادت هێنـدەی تـر گیـانی بـەرنگاری و هۆشمـەندی و ئـیرادەی نەتەوایـەتی هـەر زیندانێکی سیاسی کە بەڕاسـتی بـۆ خزمـەت کـردن بـە گـەل و نەتەوەکـەی تێکۆشاوەو نەك هەر چۆك دانادەیت ،

بەڵکو وەك شاعیری پایەبەرزی کورد ووتەنی :. هێمن ـ ی شاعیر پێمان دەڵێ

بیری ئازادیت لە زینداندا فراوانتر دەبێ

قوڕ بەسەر ئەو کەسەی وانۆکەری بێگانەیە !

ئەم کۆپلە شیعریەی هێمنی مەزن سەد دەرسە بۆ ئەو مرۆڤە خۆنەویستە شۆڕشـگێڕانە دەنگونجـێ کـە جەسـتەیان یـەك پارچـە پـۆڵاو وویژدانـی

شۆڕشگێڕانەیان ئەستوورتر دەبێ و نوچ دان لەلای (حەمەموورادیش) ئەو پەڕی ئەنگیە هەر بۆیە بەرگەی ئەو هێنان و بردن و ئازار و ئەشکەنجە و داپڵۆسینەی فاشی‌یەکانی گرت و بۆ چرکەیەکیش بیرو باوڕەکەی‌و ئاستی بەرزی هۆشیاری و ئیرادەی نەتەوایەتی کورد نەك هەر ڕێگای پێ نەئەدا پاکانە بکات بەڵکو گەورەترین تاوان بوو لای حەمە موراد و هەڤاڵەکانی کە پاکانەبکات بۆ قوتار بوونی خۆی ویڕایی ئەو ئازارە بێ وێنەیەشی گەورەترین سەرکەوتنە لەلای زۆری لە زیندانی‌یەکان ئەو ئازارو ئەشکەنجە لە ڕادە بەدەریان بە تێکۆشان و مەزندە کردبوو بۆیە خۆڕاگری و نەدرکاندنی گەورەترین سەرکەوتن دەژمارد .. بەڵێ ئەم گەلە سەر بڵندەمان چەندین مێرخاسی شۆڕگێڕی تێدایە کە گەلەکەمان شانازی بێ وێنەیان بۆ بکەن بەرزوو پیرۆزی مێر خاسە نەبەزەکانی نەتەوەکەمان ئاپسێنێ بەڵکو زەبرو زەنگ و ئەشکەنجەدان بیرت فراوان تر دەکات زیاتر هانت دەدات بۆ بەردەوام بوون لە خەبات وتێکۆشان وبەرنگاربوونەوەیان گەورەترین سەرکەوتنیش خۆڕاگرتنە لەبەر هۆش و پەلامار و ئەشکەنجەی ئەم دوژمنە داگیرکەرە خوێن ڕێژانەدا هەروەك شاعیری گەورەی کورد هێمن دەفەرموێ ...

گەرچی دوژمن وا دەزانێ من بە دیلی لاڵ دەبم

باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابی قوتابخانەیە

گەر بەئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم

نۆکەری‌و سەر دانواندن کاری نامەردانەیە

تەنانەت ئازارو ئەشکەنجە داگیر کەرانی کورد لەکەسایەتی شاعیرانی کوردیش دا ڕەنگی داوەتەوەو زیاتر ووشەکانی بە شیعردا کردۆتە فیشەك بۆ سەر دڵی دوژمن و گاڵتەی بە سیاسەتی دوژمن کارانەی دوژمن دا هاتوەتەوە .. لە هەمان کاتدا وورەو خۆڕاگری کەسانی نێو زیندانی فاشی‌یەکانی بەرزوو پیرۆز نرخاندووە کە لە ژێر ئازارو ئی‌شکەنجەی نامرۆڤانەیان دا هیچ

ورتەیەك نادركێنن و دەبنە سیمبوولی خۆڕاگری و گیانی بەرخودانی نەتەوەیی وە ئەوانەشی كە لە بەردەم دوژمن بە چۆكا دێن و تەسلیم دەبن ئەوانە ڕۆڵەی كورد نین و نامەردن و بەدوورن لە كەسێتی كوردی دا ..

هەر بۆیە چەشنی ئازارو ئەشكەنجەو ناخۆشی دەبێتە هۆی تەقینەوەو بەرنگاری دروست بوون و پاراستنی بوون ..!

ئەگەر ئەشكەنجەو ئازارو شەو نخونی نەبینێ !! چۆن دەتوانی خۆت بە سووتەمەنی نەتەوەكەت دا بنەی لە پێناو ڕزگار كردنیا چونكە هەتاوەكو چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە بمێنێت هەر گێزاو هەرگیز خەبات و تێكۆشان و دەنگی دلێری ئازادی هەر بەردەوام دەبێ و پەرە دەسەنێ خۆ ئەگەر ئێمەش نەمێنین ئەوا شۆڕش و ڕۆڵەی شۆڕشگێری ئەم نەتەوەیە لە بن نایەت و هەر بەردەوام دەبێت ڕێبازی پیرۆزی كوردایەتی وون ناكەن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش زیاتر لە خەبات و تێكۆشان سوورتر دەبن و نایەڵن جۆشدانی خەباتی كوردان دامركێتەوە ، تابە دەست هێنانی تەواوی ئامانجە ڕەواكانی گەلەكەمان .

((پێنجەم ڕۆژی زیندانیم))

لەناو زیندانی‌یەكان دا بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ مامەوە هیچ پرسیارێكیان لێ نەركردم ئیتر بۆخۆم پشویەكم دا ئەو چەند ڕۆژە هەرچەندە لە دڵی خۆمدا دەم ووت (خۆت ئامادە بكەمحمد موراد ئەم پشوو دانە هەر وانابێ ، هەر دەبێ باجەكەی بدەیت ؟بۆ كوێ ڕزگارت ئەبێ) هەر كەسێ لە دەستی ئەم فاشستانەی بەعس ڕزگاری بێ ئەوا لە هەموو شتێك ڕزگاری دەبێت و تووشی هیچ گیرو گرفتێك نابێت ؟!

لە كۆتایی ئەو پێنج ڕۆژەدا كات ژمێر (٩)ی شەو پیاو كوژەكان دیسان هاتن بۆ بەردەم دەرگای زیندانەكە هەموو خۆمان ئامادە كرد !! دەرگای زیندانەكەیان كردەوە هەروەك گەلە گورگ خۆیان پیشان دا ! كەوتنە قسە

کردن .. ها ئێستا هەمووتان چاوەڕوانن تاکو بزانن بانگی کامتان دەکەین وانی‌یە .. بە پێکەنینێکی ناقۆڵاوە ...
هەمووتان لە ترساندا دڵتان خەریکە دێتە دەرەوە وانی‌یە ؟!
کێ دەزانێ نۆرەی کێ‌یە ... بزانن ... دەی کێ ناترسێ و نالەرزێ ؟
لەناو هەموویاندا دیسانەوە پێیان ووتم وەرە دەرەوە (محمد موراد) ئادەی ...
یەکسەر چاویان بەستمەوەو بردمیان وەك خۆیان دەڵێن بۆ لێکۆڵینەوە ..
ئەی بۆ ناڵێن بۆ ئەشکەنجەدان و هەڵواسین ؟
*محمد موراد تۆ خۆت باش دەزانی ئەم چەند ڕۆژە پشوومان پێ داویت و لەسەرت وەستاوین و یارمەتی تەواویشت دراوە بۆ ئەوەی بیرێك لە حاڵی خۆت بکەیتەوە .. بزانە ئەو برادەرانەی کە لێرە کار دەکەن هەموویان هاو زمانی خۆتن و کوردن ؟!
دەبینی ئازادن هەرچی بکەن ؟! لە دڵی خۆمدا ووتم ((ئەی داڕزێن بۆ چۆن ئازادی‌یەکە هەیانە ئازادی لای ئەوان ، تەنها ئەوەیە ببیتە پیاوی جەللادی بەعس بۆ ئازاردانی ڕۆڵە نیشتمان پەروەرەکانی کورد ... گەر ئازادی وابێ ئـەوا لەشـم کرمـە ڕێـز بـێ گـەر ووشـەیەك لـەمن ببیسـتن)).
گەر حەز دەکەیت تۆش وەکو ئەوان پیاو و دڵسۆز بی بۆ حکومەتی نیشتمانی و پارتی سۆسیالستی عەرەبی ئەوا دڵنیا بە بە ئارەزووی دڵی خۆت دەبێت ئێمە تۆ بە مرۆڤێکی خاوەن ویـژدان دەزانین باوەڕ ناکەین کە تۆ هیچ شتێکمان لێ بشاریتەوە؟
حەزیش دەکەین ئەو پرسیارانە کردوومانە لێت وا دڵت ڕەق نەبێ و وەڵاممان بدەیتەوە؟! بەرامبەر ئێمە نەرم نیان بە ؟! ئەوە کاکە (محمد) تۆ بۆچی وایت !؟
–پێم ووتن وەڵامن پیاوێکی هەژارم و هیچ شتێك نازانم جگە لەوەی کرێکاری خۆم دەکەم من و کاری سیاسی ؟ من و کارکردن لەگەڵ ئێوەدا ... بە خوا

ئەكاری سیاسی ئەزانم و وە ناشتوانم كار لەگەڵ ئێوە بكەم چونكە بە من ناكرێت .

*باشە بۆچی كار كردن لەگەڵ ئێمە ناتوانی بكەیت ؟!

-قوربان من كوردی بە تەواوی نازانم كە زمانی شیری خۆمە جا كار كردن لەگەڵ ئێوەدا ؟ چی بكەم بۆم ناكرێ

*كاكە حەمە موراد بەهەمووی رازیم دەست بەجی ئازادت دەكەین و دەت بەینەوە بۆماڵی خۆتان ؟! بەلام ئەم جارە گوناهی خۆت لە ملی خۆت ڕزگارت نابێ و دەت كوژین ئەم شەو بێ ئەشكەنجە دەچیتەوەو بیر بكەرەوە تاكو سبەی ئەم كاتە بەلام ها زۆر بە وردی و بە جوانی بیر بكەرەوە لە حاڵی خۆت بەڵی بە چاو بەستراوی و بێ ئەشكەنجەو لێدان بردمیانەوە بۆ زیندانی‌یەكە كە خۆم كرد بە ناو زیندانەكان دا هەمو زیندانی‌یەكان هەر یەكی یەك بست دەمیان داچەقاندوو بەسەر سووڕمانەوە سەیریان كردم حەقە خیشیان بوو وا بەسەر سووڕمانەوە سەیرم بكەن چونكە چۆن ڕۆیشتبووم ئاوا گەڕابوومەوە بێ ئەشكەنجەو لێدان ، ئەمە بوە جێگای سەرسووڕمانی تەواو لای زیندانی‌یەكان ؟

چەند زیندانی‌یەك وردە وردە خۆیان لێ نزیك كردمەوە بۆ ئەوەی پرسیارم لێ بكەن : بەلام بە دەم چاویان دا دیار بوو كە زۆر بە گومانن لێم و تەنانەت ترسیش لەسەر دەم و چاویان دەخوێنرایەوە ؟! جا هەر نەیان شاردەوە بێ پێچ وپەنا بە تایبەتی (كاك عبدول ڕەحمان) پێی وتم

*كاك محمد زۆر لێت دەترسین ؟!

-منیش وتم بۆ برای بەڕێزم لێم دەترسن ئەی منیش وەك ئێوە نیم؟

*یەعنی تۆ هیچت نەدركاندووە

... چیان پێ بڵێم تاكو (نهێنی بێت لای من)؟!... نا ، نا براكانم هەر گیز لە من مەترسن ، ڕاستی ئەوەشتان پێ دەڵێم كە بۆچی ئەمجارەیان برام بۆ

(لێکۆڵینەوە) واتە ئەشکەنجەدان ئەوەی سەرسوڕمان کردووە کە بۆچی نەخرامە ژێر لێدان و ئەشکەنجەی نامرۆڤانەی ڕژێمی بەعسی عێراق !! ئەمەیە کە ئێوەی برامی خستۆتی ژێر ترس و دڵە ڕاوکە بەڵام با ڕاستی‌یەکەتان پێ بڵێم جەللادەکان تەنها شەویان مۆڵەت پێ دام تاوەکو بیر بکەمەوە بیرکردنەوەیەك کە مرۆڤی شۆڕشگێڕو کورد پەروەر بچێتە ژێر فشاری ئەم خوێن ڕێژانەوە لە هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتی دەشۆرێتەوە ؟! چونکە ئەوان تەنها لەبەر ئەوە ئەم شەو ئەشکەنجەیان نەدام تاوەکو کاریان لەگەڵ دا بکەم کار کردنێك بۆ سیخوڕی و خزمەت بەمانەوەی ئەو ڕژێمە فاشیەی بەعس بکات .. ئای ..کەسیان نەدۆزیەتەوە محمد مورادی کرێکاری هەژار نەبێ .. بڕواتان بێ برایان ئەوەی پاکانە بۆ ئەم تاقمە خوێن ڕێژە بکات .. گەورەترین تاوان لە دژی خۆی و شۆڕشی کوردستان و خوێنی شەهیدانی ڕاستەقینە دەکات ئیدی پێویست بەوە ناکاتبەهیچ شێوەیەك بترسن بڕوابە چیا سەرکەشەکانی کوردستان بە لە سێدارەدان و شۆڕشگێڕێکی کورد هەر لەسەرەتاوە چۆن بەرگەی هەموو ئەشکەنجەیەکی ئەم ڕژێم و دەستەو تاقمە فاشی‌یەی بەعس گرتووە ئاواو بە بڕوایەکی بە هێزوو بە ئیرادەیەکی نەتەوەی نەگۆڕەوە ئەوا ناوتوانن سوود لە کەسێکی وەك من وەربگرن .. ئەو کات برادەرانی زیندانیم باوەشیان پیا کردم و دەستیان بی توندی گوشیم کە دەبێ هەموومان بەو بڕوایەوە ئیرادەمان بەرزتر بێت کەوتینە ڕۆژی دوای (٩)ی شەو دووبارە بانگیان کردم بەهەر حاڵ زۆریان لەگەڵ ووتم و من کەمم بیست !!

- بە جەللادەکانی ژووری لێکۆڵینەوە پێیان ووتم :ـ باوەڕت بێ (محمدموراد) ئەمە دوا مۆڵەتە کە مۆڵەتمان پێ دایت ئیتر بزانە چیت لێ دەپرسین خۆتەگەر وەڵامەکە بە جوانی نەدەیتەوە ئەوا ئوباڵی خۆت لە ملی خۆت ...(بۆ ئەوەی باش بزانی یارمەتی چاك کراویت ! وەکو هەموو

کەسێك تەماشا نەکراوی ..!! دەنا(محمد موراد ئێمە دەتوانین بتکەین بە پیاو و هەموو نهێنی‌یەکیش چی‌یە پێت بدرکێنین) بەڵام تاکو هەنوکەش حەزمان نەکردووە کە زۆرت لێ بکەین لە دڵی خۆمدا ووتم (( ڕاست ئەکەن ئەی لە هەموو یارمەتی و ڕێزگرتنی مافی مرۆڤە ئەبێت لای ئەم ڕژێمە ئەشکەنجەدان و نینۆك دەرهێنان و پشیلەی ڕاهێنراو کە تێمان بەرئەدەن بە یارمەتی مرۆڤانەی لە قەڵەم بدەن))

*ئێمە ووتمان ئەمڕۆ تاسبەی‌بیر دەکاتەوەو ڕێگای ڕیزی شۆڕش و پاراستنی بەرژەوەندی‌یەکانی ئاسایشی نەتەوەیی عەرەبی بەعسی دەپارێزێ ئیتر هەرچیت لێ بکەین مافی خۆمانە بەبێ چەند و چوون .. گووناهی خۆت ئەکەوێتە ئەستۆی خۆت؟

–قوربان وەك پێم ووتن من کابرایەکی هەژارم و هیچ نازانم و ئیتر لە خۆمەوە چی بڵێم ..؟

*حەمە ... ! هەی کوڕی سەگ ؟ دیارە نەبویت بە پیاو ئەو گوێنیەت دیووە ؟ ئەگەر نهێنی‌یەکانت نەڵێیت و دان بە هەموو شتێك دا نەنێیت ؟! واتە بچوکت دەکەینەوە کە لەو گوێنیەدا جێگات ببێتەوەو بە دارەکەدا هەڵت دەواسین ؟!ئیتربەسە لەوە زیاتر ئاکاری مرۆڤانە لەگەڵ تۆدا بەکار نایەت ؟!جگە لە لێدان و ئەشکەنجەدان

–لە دڵی خۆمدا ووتم (بە خوا جوانە بۆ ئاکاری مرۆڤانە لەلای ئێوە بوونی هەیە تاباسی ئاکاری مرۆڤانە بۆ من دەکەن).

ئادەی لێیدەن تا باش بچووك دەبێتەوە ! گەورەم وامان لێداوەو بچووك بووەتەوە ..؟ باشە ئێستا بیخەنە ناو گوێنێکەوەو .. هەڵی واسن چووە ناو گوێنێکەوە ؟! هەڵی واسن ..

*بەڵێ زۆریان لێدام و بارێك و بچووك گیانیان کردمەوەو فڕێیان دامە ناو گوێنێکەوە ..

بەڵێ .. بەڵێ لەیەك كوێنـی بچووكـدا جێگایـان كردمـەوە ! تـاوەكو سبەینێ لەناو ئەو كوێنیەداو بە هەڵواسراوی وەك جۆلانێ هـەر هـاتو چـۆم دەكرد بە ئاسمانەوە ؟! جا ئازارو سڕبوون و هەناسە سواری هەر باس ناكرێ و ناگێڕێتەوە ؟!

–بۆ سبەینێ هاتنە سەرم .. ئەوە هەر ماوی .. نەمردووی ؟!.

*بەڵێ هەر ماوم و هەر دەمێنم ؟!

–ئەڵێن پشیلە حەوت ڕۆحی هەیە تۆش لەوە ئەچێ حەوت ڕۆحت هەبێ بۆیە نەمردووی لە كوێنیەكە دەركرام و لە ژوورێكی تەنیایی‌دا دانرام ! نەپێم هەبوو بتوانم هەڵسم نەتواناو ووزەشم هەبوو بێ دەست و پێ لە تاو ئازار ؟!

*بۆ جارێكی لەو ژووره تاریكەدا جەللادە قێن لە دڵەكە ئەت گووت باوكیم كوشتووە پێـی ووتم ئـەمڕۆش تـا ئێـوارێ بـیرێكی تـری لێ بكـەرەوە ؟! بـە توورەی‌یەوە دەرگایان لێ داخستم و لێیان نا ڕۆیشتن ؟

نـەموێرا زۆر ئـاو بخۆمـەوە چونكـە بیسـتبووم كەیـەكێك لـە زیندانی‌یـەكان ئەوەندەی ئاو خواردبۆوە لە تینویاندا پاش لێدان و هەڵواسین .. هـەردوو گورچیلەی وەستا بوو لەشیشـی ئاوسا بوو گیانی سپاردبوو .. بۆیـە ئاووم كەمێ خواردەوە .. نیوەڕۆ دووبـارە هاتنـەوە بـۆلام .. كەوتنـەوە قسەكردن لەگەڵمدا ..؟

*حەمـەموراد .. ئەوە نیتر ئـەمڕۆ تـا ئێـوارە ئەگـەر دان بـە هـەموو شـتێك دا نەنێیت ڕزگارت نابێت و لە سێدارە دەدرێیت ؟!

- ئـارەزووی خۆتانـە .. چیـم لێ دەكـەن ئـەوە نی‌یـە لەبەردەسـتان دام ، هەرچی‌یەك دەكەن بێ بەزەییانە ئەنجامی بدەن جـا جگـە لـە كوشتن و سێدارە چی تر ماوە بیكەن لەگەڵ مدا ؟! لەبەر ئەوە بێ باكم و هیچ لێتان ناترسم دەتانەوێت لێتان بپاڕێمـەوەو دوای بـەزەیتان لێ بكـەم ؟ چیتـان لەدەست دی درێغی مەكەن وەك پێم گووتن بێ باكم بە هیچتان نازانم .. ؟

*ئەوە چی‌یە (حەمە) ئەلێی شێت بوویت ..
-نەخێر شێت نەبووم و زۆر هۆشیارم ؟!
*ئەی ئەوە چی‌یە دەیڵێیت ؟!
-دەڵێم هەرچی ناکارو ڕەوشت هەیە لە دڕندانەییەو چونکە دڕندە دژی هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتی ..؟! هەی دڕندەکان !!
*گەورە جەللادێك بە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێزەوە ووتی وازی لێ بهێنن مێشکی تێك چووە .. ئێوارە بانگی دەکەین ..!
ئێوارە هات و بانگیان کردم ...
(حەمە موراد) ئەگەر بیبیستینەوە لەلای زیندانی‌یەکانی تر بڵێیت منیان کردۆتە ناو کوێنی‌یەوە .. ئەوا بێ چەند و چوون لە سێدارەت ئەدەین ؟! ئێستا دەتبەینەوە بۆ ناو زیندانی‌یەکانی ترو بۆخۆت بیر بکەرەوە ؟! تا چەند ڕۆژێکی تر بانگت ناکەین و هیچ پرسیارو وەڵامێکمان نی‌یە لێت .. بۆ خۆت بە باشی بیر بکەرەوەو بزانە بۆچی ئەو حاڵە بەسەر خۆت دەهێنی ؟! بۆچی تۆش وەك ئەو خەڵکە بیر لە ژیان ناکەیتەوە کە بە خۆشی بژیت ؟! گوایە تۆ چیت کەمترە لەو خەڵکە ؟بەسە ئیتر ئەم کەلە ڕەقی‌یە واز لێ بێنە ؟! هێنامیانەوە بۆ ناو زیندانەکەو زیندانی‌یەکانی تر ئەم دەزانی کات چەندە ؟! کاتێکم زانی .. هەموو زیندانی‌یەکان دەورەیان لێ دام .. پێیان ووتم : ئەوە دوو ڕۆژە لە کوێیت ؟!
خۆلەناو خۆماندا هەزار و یەك سەرەداومان هێناو برد نەگەیشتین بە هیچ دەرئەنجامێ سەبارەت بە تۆ ؟!!
هەندێکمان دەمان ووت کە گوایە ئازاد کراوەو چووەتەوە ماڵی خۆی هەندێکی ترمان دەمان ووت لە سێدارە دراوەو تەواو بە زیندووی نایبینینەوە بۆ جارێکی تر ؟
بەهەر حاڵ ، ئەوە نی‌یە ماوم تکایە زیاتر پرسیارم لێ مەکەن ...

چونکە لەوانەیە بۆ خۆتان بزانن بۆچی ناتوانم وەڵامتان بدەمەوە ؟! ئیتر بۆخۆتان چۆن لێکی دەدەنەوە ئەوا سەربەستن و کەیفی خۆتانە ؟!
ڕۆژێك و دووان و سیان ڕۆیشت .. کەس نەهات ، بەڵام بۆ ڕۆژی چوارەم دەوروبەری (٩,٣٠) تا (١٠)ی بەیانی دەبوو یەکێ لە جەللادەکان هات و بانگی کردم و چاویان بەستمەوەو بردمیان ، بەڵام وەك جاران تووڕەنەبوو لەگەڵم .. پاڵی پێوە نەئەنام :
ئەوەندەم زانی چوومە ژوورێکەوە ڕوانیم .. دووکەس دانیشتوون .. کەوتنە قسە کردنی خۆش لەگەڵم دا ؟!
*کاك محمد بۆچی دوو قسەی خۆشمان بۆ ناکەیت ؟ خۆئەگەر بەڵێنێکی بچووکمان پێ بدەیت ئەوا هیچمان لە تۆ ناوێت ؟! چونکە ئێمە دەمانەوێت ئازادد بکەین ؟! لەهەموو تاوان و کەم وکوڕیەکانت بتبورین ؟! تەنها دەمانەوێ لە مانگێك دا چەند جارێك سەردانمان بکەیت .. بەبێ ئەوەی ئێمە بنێرین بە دواتا ، هەر خۆت بێیت بۆسەردانمان ؟! خۆ ئەگەر هەرکەسێکیش خۆت لێی دڵنیایت و گەواهی بۆ بدەیت کە قسەمان ناباتە دەرەوە هەر کارو فرمانێکی هەبوو بۆلامان ئێمە هاوکاری دەکەین و یارمەتی تەواوی دەدەین ؟!ئەوەش دەمانچەیەکمان بە دیاری بۆ داناویت و لێمان وەربگرە ؟حەز دەکەین ئەم داواکاریە بچوکەمان ڕەت نەکەیتەوە ؟ ئەگەر ڕازی بیت هەر ئێستا دەتوانی بڕۆیتەوە بۆ ناو ماڵ منداڵی خۆت ؟! حەزیش دەکەیت کەلەمەو لا کرێکاری نەکەیت ؟! هەر کارو پیشەیەکیش خۆت پێشنیاری دەکەیت ؟! ئەوا بۆت دەستە بەر دەکەین و بە ئارەزووی خۆت کارت بۆ دیاری دەکەین
-منیش پێم وتن قوربان من کابرایەکی هەژارو بێ دەستەڵاتم و ناتوانم سەردان و هاتوچۆتان بکەم و هیچ کارو پیشەیەکیش پێشنیار ناکەم جگە لە کرێکاریەکەی خۆم و کەسیش ناناسم تاکو بینێرمە لاتان !!! مەسەلەی

دەمانچەش بە دیاری !! من بۆچیمە کابرایەکی بێ کەس وهەژارم و خەریکی کاری خۆم دەبم و بژێوی بۆ منداڵەکانم پەیدا دەکەم بۆیە ناتوانم چەکتان لێ وەربگرم ئەگەر بەو مەرجانەی کە جەنابتان دەڵێن ئازادم دەکەن ئەوا ناتوانم هیچیان پەسەند بکەم ، داوای لێبوردن دەکەم ، چونکە ئەوەی ئێوە داوای دەکەن بە من ناکرێت و لە توانامدا نی‌یە ئەوئەرکە جێبەجێ بکەم ؟

*ئۆ ...هۆ ..تۆ هەر دەبی کارەکەمان لێ تێك بدەی و ڕێسەکەمان لێ بکەیتەوە بە خوری !!(حەمە موراد) !! ئێمە ئەوە چەند سەعاتە قسە بۆ تۆ دەکەین و ئامۆژگاریت دەکەین !؟

کەچی تۆ بەیەك ووشە هەموویت پووچ کردەوە ... ئێمە دەمانەوێ کارت بۆ دابین بکەین ؟! گوزەرانت باشتر بکەین ..کەچی ڕازی نابیت ؟بۆچی ئەوەندە کابرایەکی ووشکیت ؟!

–قوربان من ووشك نیم بەلاّم لەوە زیاتر لە تواناو ووزەی من دا نی‌یە و مرۆڤ کاتێ نەیتوانی ئەنجامی کارێ بدات ناچێتە ژێر ئەو کارەوە بۆیە ئەو کارو فەرمانانەی کە جەنابتان دەفەرموون بە من ناکرێت و حەز لەو جۆرە کارانە ناکەم ئەوکارانە جگە لە ئێوە کەسی دیکە ناتوانێ ئەنجامی بدات !! کەس شایستەی ئەو کارانە نی‌یە .. بێجگە لە جەنابتان ؟!

*ئەوە (حەمە موراد) دەتەوێت پلارمان تێ بگریت ؟! ئێمە دەمانەوێ ڕێزت لێ بگرین !! کەچی تۆش ئەوە وەلاّمەکەتە ؟!

–باوەڕ بفەرموون من پلارتان تێ ناگرم ورێزم هەیە بۆ قسەکانی بەڕێزتان بۆیە زۆر سوپاستان دەکەم .. ئێوە ڕێزتان لە من گرتوە !زۆر سوپاس .

*لە پڕێکدا وەك بڵێی زەمین لەرزە بووبێ ..نەڕاندی ئادەی (وونی کەن) لەبەرچاوم بیبەنەوە بۆ ناو زیندانی‌یەکانی تر دیارە نەبووە بە پیاو ! قسەکردن بۆ حەمەموراد هیچ سوودێکی نی‌یە نەدەزانێ قسە بکات نە دەزانێ کارێك ئەنجام بدات ؟!

-قوربان من دەزانم قسە بکەم و کار بەڕێوە بەرم بەڵام ئەو کارەی کە ئێوە دەیڵێن کاری من نیەو شایستەی بەڕێزتانەو هەر لە ئێوە جوانە

*کاك محمد موراد ئێمە هەرچی هەوڵ ئەدەین کارێکت بۆ دیاری بکەین ، تۆ ڕازی نابی ڕەتی دەکەیتەوە ؟! چەند ڕۆژێکی تر لامان دەمێنیتەوەو پاشان هەوڵت بۆ ئەدەین کە ئازادد بکەین ؟! وە تەنها یەك داوامان هەیە لە تۆ ؟ ئەم داوایەمان ڕەت مەکەرەوەو خراپ نی‌یە ؟

-فەرموون داواکەتان چی‌یە ؟!

*لای کەس قسە مەکەو باسی هیچ مەکە ؟! مەڵێ وایان لێ کردم یان واو وایان لەگەڵم کردووە نە لە ناو زیندانی‌یەکاندا نە لەدەرە وەش ؟!

-باوەڕ بکە باسی هیچ ناکەم ، بەڵام ئەوەندەم پێ بڵێن بزانم لەسەر چی گیراوم ؟! خۆ دەبێ گوناه وتاوانی خۆم بزانم !! چونکە ماوەیەکە زیندانیم لێرە لەسەر چی بووە ؟..

*بیبەنەوە بۆ زیندانەکە باجارێ لەوێ بمێنێتەوە .. بەڵێ گەورەم بردمانەوە بۆ ناو زیندان .

بەڵێ پاش ئەوەی بردمیان بۆ زیندان بەڵام ئەم زیندانە زیندانەکەی ئەو ڕۆژانەی پێشوو نەبوو کە تیا بووم !؟ چونکە ئەو کەسانەی لێرەن هیچیان ناناسم ؟! لە بیرم چوو بۆتان باس بکەم ئەو زیندانە ناوی (هەیئەی کەرکوك)ە .

چوار زیندانی هەیە دوو زیندانی بۆ پیاوانە کە یەکێکیان بۆ ئەو کەسانە بوو کە لە دەرئەنجامی ئەشکەنجەو لێدان بە خەستی بریندار دەبن بۆ ماوەیەك تاکو هەندێك دێتەوە سەر خۆی زیندانی لەوێ زیندان دەکرێ کە خۆم یەکێك بووم لەوانە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەوێ مامەوە ؟! زیندانێك بۆ ژنان و زیندانێکیش بۆ تەمەنی خوار هەژدەساڵ ؟!ئەوەی سەر سوڕهێنەرە لەم زیندانەدا هیچ پاساوێك ناخوات بۆ ئەم دوژمنە داگیرکەرو دڕندەیەی

نەتەوەکەمان کە ئەوەیە کە منداڵ بی لە تەمەنی حەوت وهەشت ساڵیەوە تیایدا زیندانەیەوئازارو ئەشکەنجە دەکرێن و داوای نهێنی درکاندنیان لێ دەکەن !

ئازانم من هەرچەند بیرم لەم کارە چەپەڵەی ئەم ناحەزانە دەکردەوە بۆ ئەوی‌شتێك بدۆزمەوە ؟!

بزانم کەی ئێمە ئەوەندە بێ باك بووین لە ژیانی مرۆڤ ؟! بە تایبەت لە ژیانی جگەر گۆشەکانمان چونکە بەهێندەی گەڕان وبیرکردنەوەو لە خوێندنەوەی پێشووم ئاگادار بم لە ئاکارو ڕەوشتی نەتەوەکەم مێژووە پڕ لە سەروەری‌یەکەی نەمبیستووەو نەمبینیوە کە هیچ نەتەوەیەکی تر لە مێژووی دوور و نزیك دا بە هێندەی نەتەوەی من سەرچاوە بێت بۆ گەیاندنی پەیامی مرۆڤایەتی ، بەڵکو دەبێ گەلانی تر لەوەتێ بگەن کە بگوترێت کورد دایکی مرۆڤایەتی‌یە ؟! ئەوە زۆر دڵگرانم ئارامی لێ هەڵگرتووم و ئازاری لاشەمم لەبیر چووبووەوە ؟!

وە ئازارێکی تری ناخۆش تەنگی پێ هەڵچنیوم لە دڵی خۆمدا هەرلێکم دەدایەوەو دەم هێنا و دەم برد ...

خوایە تۆ بڵێیت ئەو شۆڕشگێڕانەی ئێمە کە ڕابەرایەتی نەتەوەکەیان بکەن بێ ویژدانبووبن و خۆیان لە بیر کردبێ ئایا دەبێ ئەوان بەو کارە ڕازی بن ؟ یان دەبێ کێ نەخشەی بۆ دانابێ ! ئەمەکارێکی لە کردن نەهاتووەو هیچ

شتێك ناتوانێت هۆشمەند بێت و بیسەلمێنێ !! تەنانەت ئەگەر سەركەوتن بەوانیش بە دەست بێت ؟! چۆن چاو بەرایی دێت ئەم جگەر گۆشانە بكەن بە سووتەمەنی ؟! مەگەر مێژوویان باش نەخوێندبێتەوەوچ ویژدانێك ڕازیە ؟ ئاكارو ڕەوشتی خۆیان لەبیر كردووە ؟ بە بیری پیرۆزی نەتەوەی كورد دەفەرموێ (دایكان و باوكان بەرپرسی یەكەمن لەبەخێوكردنی منالەكانیان ، چونكە منال پیرۆزی تەواوی هەیە .

چۆن ناگەم دەتوانین هەلگری بیری پیرۆزی مرۆڤایەتی بین بوونمان بپارێزن !!)چونكە كەس ناتوانێ مندال بخاتە ژێر هیچ جۆرە فشارێكەوەو پەیوەستی هیچ بیرێك نەبێت تاوەكو نەگاتە سەرو تەمەنی (١٦)سالی و ئەو كاتەش هەر خۆی سەرپشك دەبێ لە دیاریكردنی ڕەوتی بەرێوە چوونی ژیانی بۆیە مێشكم خەریك بوو نالەی لێوە بێت و بتەقێت ، چۆن دەبێ مندال بەو تەمەنە ناسكەدا كارێكی پێ بكرێت و بكەوێتە دەست ئەم دوژمنە داگیركەرو درندەیە ؟! (ئیتر بێ سلەمینەوە برۆ بەرەو پەتی سێدارە ، مردن لەترست ڕادەكات و ڕۆحی تۆ هەرگیز نەمرە) ..

ئیدی بەهۆی ئەو سەرقالكردنەوەم بەو كێشەیەوە دەهاتم و دەچووم لە ڕاڕەوی زیندانەكەداو بینیمی ئەوانەی كە ئەشكەنجە دەدران و لەگەل شارەزایم بە كون وقوشبنی زیندانەكە ، چ بە هۆی ئەشكەنجەدانم لە ڕۆژانی پێشوودا بووبێ چ بەهۆی ئەم پشوو دانەی بۆ چاكبوونەوەی برینەكانم !!

ورده ورده لەسەر خۆ بەگەواهی چاوو هەست و بیرو وەك دەلێن هەموو هەستەكانی كە لە مرۆڤدایە بۆم سەلمێنرا كە گرتن وزیندانی كردنی و ئەشكەنجەدانی ئەو منالانەی كورد ، لەبەر ئەوە نیە كە كارێكی دژ بەم ڕژێمە خوێن ڕێژو داگیركەرەیان كردبێ ؟! وەیان هیچ پلان و نەخشەیەكی تری كرچ وكال بە شۆڕشگێرانی كوردەوەنیە .. بۆئەم كێشەیەی كە ڕووی داوەو ڕوونەدات چونكە هۆشی شۆڕشگێران و كورد زۆر

فراوانترو ڕوناکبین تره و لەسەر چەمکێکی مرۆڤایەتی دەڕۆن و ئامانجیان بە دیهێنانی ئازادیيە ، بۆيە ئەو کارە ناشايستەيەو ناڕەوايە لە شانو شەرکەتی ئەوان ناوەشێتەوە ئيدی تەواو دڵنيا بوم بێ پێچ و پەنا و بێ گومان بووم لەوەی کە ئەم ڕژێمە ڕەگەز پەرستەی بەعسی عێراقە هەر لە چوارچێوەی ئەو نەخشەيەی کە دايان ڕشتووە بۆ بنەبڕکردنی کورد و بە عەرەب کردنی خەڵك و خاکە پيرۆزەکەی کوردستان .

ئەم ڕێگايەيان هەڵبژاردووەو هەموو کارێکيان بۆ قڕ کردنی کورد بگونجێ بۆيان بە ئەنجام دەگەيەنن ، جا بۆيان بلوێ لەپێش هەموو تەمنێکەوە گورز لە منداڵی سەربێشکەی کورد دەوەشێنن و دەيانکوژن !!

هەر بەتاوانی ئەوەی کەکورد ن و بە کوردی لە دايك دەبن ؟! ئەوەش وانەو پەندێکی تری ناو زيندان بوو بە بەێ هيچ سەرچاوەيەکی نووسراو يان بيستراو بە بێ هيچ هەواڵێك بۆ لێکۆڵينەوە ، لەبابەتێکی وا کە لە پێشتر وەرم گرت و چووە سەر خانەی بيلۆگرافيای ژيانم ! ئەو شێوە ژيانەی نێو زيندانم بوە فاکتەرێکی بەهێزبوونم کە تاماوم لە ژياندا هەوڵ و کۆششم بەردەوام بکەم و بێ پەرواش درێغی نەکەم بۆ خاکەکەم ڕزگار کردنی نيشتمانی کوردستانی زامدار کە لەژێر پۆستاڵی ڕەشی داگيرکەرانی بەعس بکەمە وانەيەکی زيندووی تراژيديای ژيانی کوردو زياتر شێلگيربم لەسەر باوەڕی بەرزوو پيرۆزی نەتەوەکەم بۆ ڕزگار بوون و ئازادی يەکجارەکی ، بەڵێ .. (بێ ئەوەی قسەبکەم لای کەس ، چەند ڕۆژ لەو زيندانەدا ژيانم بردە سەر) هەستم بەوە دەکرد کەلەوانەيەبەمەرگ لە دەستی ئەم دڕندە داگيرکەرانە ڕزگارم بێـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــت؟!

(بەڵام کەی ئازاد دەکرێم ؟! نازانم)... !!؟ خواردنی ژووری زيندان هەر هەمان خواردنەکەی جارانبوو سەمونێکی ڕەق و هەندێ جاريش تەماتەيەك يان

خەیارێك كەئەمە ژەمەكانی خواردن بوو كە زۆربەی جاریش هەربەتەنیا سەموونە ڕەقەكە بوو ، هەندێ جاریش تەماتەیەك یان خەیارێك ؟
ئەو سەموونە ڕەقە لە ڕەقیدا لەمانەوەشیدا هەندێك جار كەڕووی هەڵهێنابوو بەڵام بە ناچاری دەخورا دەنا ئەمە بۆ خواردن نەدەبوو ..!وە ئەو خواردنەشت بۆیە ئەدەنێ تەنها لەبەر ئەوەی تووزێ (وزەیەكت) تیابمێنێ و بەرگەی ئەشكەنجەو لێدان و هەڵواسین بگریت تاوەكو سوودت لێوەربگرن نەك بە خاتری ئەوەی كە بژیت پێی ..هەر لێرەوە زیندانییەكان لەو ڕاستییە تێگەیشتبوون ئەم خوێن ڕێژانەی بەعس نەك هەر بیریان لە بنەماكانی مافی مرۆڤایەتی نەكردبۆوە بەڵكوو گاڵتەشیان پێ دەهات ... مرۆڤایەتی و سیاسەتی داپڵۆسینی ڕژێم ئاسمان و ڕێسمانی بەین بوو هەموو لێكۆڵینەوەو ئەشكەنجەدان و دواتر لەتە سەمونێكی ڕەق بۆ زیندانییەكان هەر بە خاتری ئەوە بوو تاوەكو بتوانن بەو ئومێدەی هەندێك زانیاریت لێ دەربهێنن !! بە خۆیان ڕەوا ببینن و پاساوێك بێت بۆ كوشتنی كورد ئیدی چ بە كۆمەڵ بێت یا بەتاك ؟ چۆن ئەم ڕژێمە هەر لە بیری ژەهراوی خۆیدا بوو ، بە چ سیاسەتێك زیندانییەكان بتوانێ دەستە مۆ بكات و دواتر بڕیاری نادادی خۆیان بدەن بۆ لە سێدارەدانی و كوشتنی مرۆڤی كورد ..
ئەو ماوەیەی كە لەوزیندانەدا بووم قسەم لەگەڵ كەس نەدەكردوو نزیك نەدەبوومەوە چونكە ڕاستییەكەی لەوە دەترسام كە لە ناو زیندانەكاندا خەڵكێك هەبێت سەر بە ڕژێم بێت و قسەكانم بگوێزنەوە هەر بۆیە ڕێگای بێدەنگیم هەڵبژاردوو وام بە باش زانی كە گۆشەگیربم ڕۆژێكیان ، كاتژمێر (٩)ی سەرلەبەیانی بوو بانگیان كردم چووم بۆ بەردەم دەرگای زیندانەكە !؟ هێندەم زانی دەرگایان كردەوەو یەكسەر چاومیان بەستەوەو دەستمیان بە كەلەبچە شەتەك داو بردمیان ..

بەڵام ئەوەندەم زانی ئەم جارەیان نەبرام بۆ ژوری ئەشکەنجەدان بەڵکو برامە ژورێکی ڕازاوە دوای ئەوەی چاویان کردمەوە .. زانیم لەو ژوردام بینیم دوو لە زیندانییەکان ئەو زیندانەی کە پێشتر تیا بووم دانیشتبوون ..! دڵم خورپەیەکی کردوو هەڵوێستێکی وا کەوتە بیرو هۆشم .. کە تۆ بڵێی ئەم دوو زیندانییە پیاوی ڕژێم نەبووبن .. بۆیە گومان هەموو هۆشی داگیرکردم پاش ئەوەی فەرمووی دانیشتنی لێ کردم دانیشتم یەکێك لە پیاوە جەللادەکانی ڕژێم کەوتە قسە کردن لەگەڵم دا :ـ بەڵام قسەکانی بۆ هەر کەسێکمان بوو کەقسەی دەکرد ..

ئیدی ئاوێ کرا بەدڵم دا گوێم گرت لە قسەکانی ، بزانم ئەم دڕندەیە چیمان پێ دەڵێ و ..؟ بەم شێوەیە کەوتە قسەکردن :ـ(حکومەت باوکی گەلەو لێبوردنی هەیە ؟! ئەگەر بەربوون و ئازاد کران باسی ئەشکەنجەو لێدان و ئازاردانی ئێرە ناکەن لەلای خەڵکی ئەو شتانەی کە لەگەڵتانا کراوە لە ئەشکەنجەداندا بەرامبەرتان و وە ئەو قسەو باسانەی کە لەگەڵتانا کراوە بە هیچ جۆرێك نابێ لای کەس باس بکرێت وکەس بزانی بەپێی توانا و شارەزایی خۆتان دەبێ باسی چاکەو لێبوردن و بەخشندەی حکومەتی عێراق بکەن و خەڵك واتێ بگەیەنن کە تەنها حکومەت پشت پەناو دادەی تاکەکانی گەلەکەمانە ؟ خۆ ئەگەروانەبێ و ئەم قسانە نەپارێزن ئەوا زۆر ئاساییە جارێکی تر دەگیرێنەوەو ئەمجارەیان کەس دادتان نادات .. وە ئەزانن کە بەر بوون هیچمان پێ ناگاتەوە ؟ ئیتر ئەو کاتە ئوباڵی خۆتان بە ئەستۆی خۆتان ... چونکە بۆ جارێکی تر دەگیرێنەوەو تەنانەت لەسەر سادەترین شت کە درکاندبێتان ئەوا لێدانتان زیاتر و زۆرتر دەبێ و تاکولە سێدارەدان دەتان گرێتەوە ..! ئەمەش دەمێنێتەوە سەر خۆتان ...!!

وە ئێستا دەگەڕێنەوە بۆ ناو زیندانەکەتان ..؟! وە هەر کەسێکی زیندانی پرسیاری لێ کردن بڵێن :ـ بانگ کراین بۆ لێکۆڵینەوە و لەوانەیە حکومەتی

نیشتمانی لێبوردنی هەبێت بەرامبەر بە ئێمەو خەڵکانی دیکەی وەکو ئێمە..
!

هەرئێستا بڕۆنەوەبۆ ناو زیندانی‌یەکانتان تاکو جارێکی تر خۆمان بانگتان دەکەین ... ئومێد دەکەین کەچی‌دی بەقسەو قسەلۆکی کەسانی تێکدەرو ئاژاوەچی فریو نەخۆن و نەکەونە ژێر فشاریانەوەو بە دوویاندا نەکەون ؟!
–چاوەڕوانی بەخشندەیی و لێبوردنی حکومەتی نیشتمانی بکەن گوێ لە قسەکانمان بگرن .. یان ..ئائەوانە بەرنەوەبۆ زیندانەکە .. بەلام با محمد مورادمان لابمێنێتەوە هەندێك کارمان لەگەڵی ماوە پاش ئەوەی دوو زیندانی‌یەکەی تریان بردە دەرەوە؟!ڕووی تێکردم !(محمدموراد) هەروەك پێشو دەزانی تۆ کەسێکی ورشکی‌وقسەوەرناگریت یاکەمێك هۆشت پەیدا کردوە کابرای جەللاد :ـــ ((بەشێوەیەك قسەی بۆ دەکردم ،ئەگەر کەسێ‌یەکەمجاری بێت وگوێی لەوقسانەبێت ئەڵێ بەخوا قازانج و بەرژەوەندی ئێمەیان دەوێ)) !؟
لەقسەکانی‌دا پێ‌ی‌ووتم :ڕۆڵە(محمد موراد) هەموو کەسێك هەوڵی ژیانی خۆش و پاراستنی خودی‌خۆشی‌دەدات ،بۆیە منیش حەزدەکەم ئامۆژگاریت بکەم و حەزیش دەکەم پێت بسەلمێنم ،حەمە موراد باوەڕبکە دەمەوێت باش گوێ بۆ قسەکانم بگریت و سەرنج بدەیت و بزانیت لەبەرژەوەندی تایبەتی خۆتە یان نا ... ؟!
بزانە لە ئێستا و لە پاشە ڕۆژیش دا سوود مەند دەبێت بۆت یان نا ..؟!
کاك (محمد موراد) مرۆڤ دەبێت هەندێك جار تەماشای بارو دۆخی تایبەتی خۆی بکات ادەبێ دوور بێ بیت وتۆش ئاوڕ لە ژیانی خۆت بدەیتەوە !؟
هەمیشە سواری ئەسپی شێت نەبێ !! پێویستە مرۆڤ بیربکاتەوەو پرس و ڕای خۆی بکات بە تایبەت بەو کەسانەی کەلە تەمەندا لە خۆی گەورەترن ؟!

بەڵام شارەزایمان لەسەر بارودۆخی ژیان و کۆمەڵ هەیەو بەتایبەت بۆ ئەمڕۆکە کە ژیانی زۆر گرانە و گۆڕانکاری زۆر ڕووی داوە لە کۆمەڵدا ؟!
هەرچەندە لە دڵی خۆت دا ئێستا دەڵێی ((ئەمە کابرایەکی خۆ فرۆش و بەعسی‌یە و لە دەزگای ئەمن و ئیستخباراتی ڕژێم کار دەکات !؟ و چۆن دەبێ من بە قسەی ئەم پیاو خراپە بکەم)) ؟!
گەر هەروا بیر دەکەیتەوە ئارەزووی خۆتە بەقسەی من نەکەی ، بەڵام ئەو کات تێ دەگەی زیان بەخش دەبێت یان سوود بەخش ؟!
ئەو هەر قسەی خۆی دەکرد ، منیش کەوتمە دەریای خەیاڵ و قسەکردن لە دڵی خۆمدا ئەو شتەی پێی دەڵێن سەیرو سەمەرە ئەمەیە ..!
((بە خوا جوانە ، کابرایەکی پیاو کوژی دژ بە مرۆڤ و خۆفرۆش و ئەڵقە لەگوێی ڕژێم ، ئامۆژگاریم بکات و لە بەرژەوەندیم بکۆڵێتەوە و ڕێگای چاك و خاپم بۆ دەست نیشان بکات ؟! داب و نەریتی کۆمەڵایەتیم فێر بکات ؟!
فێرم بکات چۆن بیربکەمەوە ، خۆ ئەگەر بە ئامۆژگاریەکانی (عەزە)ی سیخوڕەوە سودمەند بم یا بەرژەوەندیم بپارێزێت ؟ ئەوا با ئەوەندە زیانم پێ بکەوێت تاکو سەریشم تیا دەچوو ؟! توو خوا چش لەو ژیانە .. ئەمانە تاکو ئێستا دژی مرۆڤن و دژی هەموو کەسێکی ئازادیخوازن ئەوە تاوەکو ئێستاکە چاوم بە چەند منداڵ کەوتووە کە لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەی ئەم جەللادە فاشیستانەی ڕژێمەوە گیانیان لەدەست داوە ، هەرچەندە دوو ڕۆژ لەمەوبەر بوو ، لەگەڵ خۆم دا و بەبەرچاوی خۆمەوە دوو منداڵیان لە ژێر ئەشکەنجەی نامرۆڤانەی بەعسی‌یەکاندا کوشت و فڕێیان دانە دەرەوە ، تەنانەت لەخوار ڕێزی هەر شتێکی پیسەوەش ڕێزیان لێ نەگرتن ؟!
ئەمانە بەقەد تاڵە موویەك چی‌یە بەزەیی نازانن و لە دڕندەیدا بێ وێنەن و منداڵانی کورد لە جیاتی خوێندن و پەروەردەکردنیان لە خوێندنگا و زانکۆکاندا ، بە لێدان و ئەشکەنجە لە زیندان دا پەروەردە دەکرێن ،

پەروەردەی ئەشكەنجەدان ، دەبێ تاكەی چاوەڕوانی گیانی بەرخودان و شۆڕش بكەی تا ئەندازەی كوردێكی پڕ جۆش و نەتەوە جۆش بدەنەوەو بلێسەی مەشخەڵی شۆڕش بەرزبێتەوە ؟!

تۆ بڵێی ئازدایخوازانی جیهان ڕاست بێت و هەر ناو نەبێ مافی مرۆڤ ؟!

تۆ بڵێی دەنگی ئێمەیان پێ نەگەیشتبێ ، ئەی نالێن مرۆڤی ئازادی خواز جیاوازی ناكات لە نێوان خاك و نەتەوەكان دا ؟ و هاوكاری و یارمەتی هەموو ئازادی خوازێكی تری ژێر دەستە و كۆیلە كراو دەكەن ؟!

خۆ ئەگەر وایە و ڕاستە و تەنها قسەی ڕووت نییە ؟ ئەی بۆچی ئازادیخوازانی جیهان و ڕێكخراوی مافی مرۆڤی جیهانی هاوكاری و پشتیوانی لە ئێمە ناكەن ؟! تۆ بڵێی جیاوازی لەوەش دا هەبێت ؟ كە ئازادی بۆ نەتەوەیك ڕەوا بێت و بەڵام بۆ نەتەوەیەكی بن دەست ناڕەوا بێت !؟ ئەگەر وانەبێ بۆچی (ئازاد محمد ئەمین) خوێندكاری پۆلی یەكەمی ناوەندی‌یە هەر لە پۆلەكەیەوە لە خوێندنگا بێ ئەوەی كەس و كاری بزانن چی بەسەر هاتووە ، یان لە كوێیە ؟!

كەس وكاری نازانن كە زیندانی كراوە ڕۆژانە بە دوایدا دەگەڕێن و جێگای دەزگا سیخوڕەكانی بەعس لە ناو شارو زیندانەكان نەماوە بە دوایدا نەگەڕێن وە دەبوو ڕۆژنامە و بڵاوكراوەكان ناوەكەی بڵاو بكەنەوە لەگەڵ وێنەكەی بۆئەوەی بزانرێ لە كوێیی و بە دیار بكەوێت ؟! ئائەمەیە پەروەردەی بەعسەكان !؟ .. كەچی ڕژێم گرتوویەتی و خۆی لێ كەڕ كردوەو باسی ناكات !؟

((وێنەی ئازاد محمد ئەمین))

یان نەسرین عەبدوولاّ ، جگە لەوەی کە کچە کوردێکە ، دەبێ تاوانی چی بێت لە ماڵی خۆیانەوە دەریان هێناوەو ئەوە ماوەی دە بۆ پانزە ڕۆژ لە زینداندایە

((وێنەی نەسرین عبدولاّ))

له ژێر ئەشکەنجەو لێدانی ئەم دڕندە نامەردانەی بەعسی عەرەبیدا دەناڵێنی

ئەی هاوار  لەم سەدەی بیستەمدا ، کە جیهان گۆڕانکاریەکی زۆری لە ڕووی هۆش و تەکنەلۆژیاوە بە خۆیەوە دیووە و زۆر نەتەوە ڕزگاریان بوو و گەشتیشن بە مافی خۆیان ! بۆ دەبێ بۆ ئێمەی کورد سەدەی جەورو ستەم بێت و تازەترین تەکنەلۆژیا بۆ ئەشکەنجەدان و بنەبڕکردنمان  بەدەست ئەم دژە مرۆڤە دڕندانەدا بە کاری دەهێنێ و ڕۆژ بە ڕۆژیش زیاتر فشاریفاشستانەی خۆیانبخەنەسەرمان تاوەکو بە دڕندەترین شێوە پەلامارمان بدەن !
بۆ دەبێ گەلە کۆمەکی بە تەنها لە جیهانەوە لە هەموو حکومەتەکانەوە بەبەرچاوی ڕێکخراوی (وەك حکومەتەکاندا و یان نەتەوەیەکگرتوەکان)وە دا لە کورد بکرێ ؟! ئایا دەبێ چی هەبێت ، کورد چی کردبێ ؟ تۆبلێی شەڕەکانی جیهانی ، کورد نەیکردبێ ؟! بۆ ئێستا هەموو وڵاتانی جیهانی یەکیان گرتبێ بۆئەوەی کورد ئازاد نەبێ جارێکی تر لەم سەدەی بیستەدا کە مرۆڤایەتی وەك دەڵێن شەقڵێکی گەورەی بڕیوە بەرەو پێشەوە ، تازە بە تازە فاشستەکانی بەعس بڕیاری نەمان و بنەبڕکردنی بە تاك و کۆمەڵی کوردیان داوە و جێ بەجێی دەکەن ؟!
ئایا تاکەی هاوارو ناڵەی کوردی ئازادی خواز نابیستێ ؟
ئەی ئەو وڵاتانەی کە بە تینووی مافی مرۆڤ و دیموکراسیو ئازادی خوازی دروشمتان بەرز کردۆتەوە تاکەی میللەتێکی وەك کوردی بن دەستی بەعسیە دڕندەکان ناخوێننەوەو گوێ لە خواست و ئامانجیان ناگرن هەر لەبەر ئەوەی کوردن ؟!
ئای بۆ میللەتی کوردی زوڵم لێکراو  ئێستاکە دەزانم هەر نەتەوەیەك کیانی خۆی نەبێت وەك مرۆڤ سەیری ناکەن ؟

ای ئەو هەموو [illegible]

ئەیەها و سەدەهامان لێ ئەکوژن ، سەرەو نگومان ئەکەن ، کردەوەی ڕەشە کوژیمان لەگەڵ دا بە کار دێنن تەنیا بە خاتری ئەوەی لە نەژادی خۆمان واز بێنین و نەڵێین کوردین ؟

ژیانی مرۆڤی کورد هەمووی تراژیدیایە و بە چەندین بەڵگە نامەو دیکۆمێنت جێگای نابێتەوە .. کە بەعسیەکان لە دژی ئێمەی کورد ئەنجامی ئەدەن ئەمەش بەڵگەیەکی تری ئەو دڕندانەیەتی‌یەی ڕژێمی بەعسی صدامی‌یە نەک هەرتەنها بۆ گەلی کوردمان بەڵکو بۆ خوارووی عێراق و شۆڕشگێڕە ئازادیخوازەکانی بەنەژاد عەرەبیشن ؟!

وێنەکانی بارزان محمود ١٢ساڵان

ئاوێستە محمود ١٤ساڵان

ئەو دوو منداله کە ناویان بارزان محمودەو دوانزە سالانەو ئاوێستە محمود چواردە ساڵانە .. ئەمانەش هەر لە خوێندنگاوە دەسگیر کراوون و هێناویانن بۆ زیندان وبەندیان کردوون کەوتوونەتە بەرشالاو و پەلاماری دڕندانەی ئەم بی بەزەییانەو خراونەتە ژێر ئەشکەنجەوە ..!

بەیانی لە ماڵەوە هاتوون بۆ خوێندنگا ئیتر نەگەڕاونەتەوە دەبێ ئەم دوو منداڵانە تاوانیان چی بێت ؟!

تۆ بڵێی هەوڵی کودەتایان نەدابێ و سەرنەکوتن و دەسگیر کرابن ؟! یان بڵێی ئەمانە لەپارتێکی رامیاریدا کاریان نەکردبێ بۆ دروست بوونی پارتێکی سیاسی ؟ وەیان تۆ بڵێی بە نەخشەی ئەم دوو خوێندکارە نەبێ بەرزای‌یەکانی جۆلان کەوتبێتە دەستی ئیسرائیلی ؟!

ئەگەر ئەوەش نەبێ گرتنی بیابانی سینا ئەمانە پرۆژەکەیان پێشکەش بە ئیسرائیل کردووە ؟!

ئەگەر ئەوانە هیچیان نەبێ ئەوە ئەم دوو خوێندکارەن کە بوونەتە کۆسپ و ڕێگر لەبەردەم یەکگرتنی نەتەوەی عەرەب !! ئەی خودایە بڵێم چی ئەم منداڵانە دەبێ چیان لە دەست بێ !! بەرامبەر بە دوژمنێکی ئاوا دڕندەو بێ بەزەیی .. ؟! بەڵام جگە لەوەی کە کوردن هیچ تاوانێکی تریان نی‌یە واتە چەوسانەوەو جەورو ستەم بمێنێ شۆڕش و ڕاپەڕین هەر دەمێنێ .. تا چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە بەردەوام بێت دەنگی خەباتکاران و شۆڕشگێران هەرلە برەودابێ .. خەباتی درێژ خایەن درێژەی دەبێ ئازادی تەواو دێتە دی‌ئەوکات .. ؟ کوردیش هەتا لاوانی شۆڕشگێڕو ئازادی خوازی وەك ئەمانەی هەبێ هەر زیندوو دەمێنێ و هەرگیزاو هەرگیز نامرێ و هەر ڕۆژێکیش دەبێت بگا بە ئاوات و ئامانجەکانی وەك نەتەوە ئاسوودەکانی جیهان دەبێ ئەم گەلەمان بگا بەو ڕۆژەی کەخاوەنی(کیانی) خۆی لەم بیر

کردنەوە بێت . (قەوارەی) کۆڵ دانی گیانی بەرخودانی هەرگیزاو هەرگیز دانامرکێتەوە ..؟!

لە پڕ ڕاچەڵەکیم !! دیار بوو دەنگی بەرزکردبۆوە کە دیم ئەو هەر دەی ڕێساو بەردەوام بوو لەو ووتنی ئەم کەین و بەینە .

نزیکەی(٣) کاتژمێری خایاندو دواتر بردمیانەوە بۆ زیندانەکە ..؟! ڕۆژی دوای پاش نان خواردن نزیکەی (٩)ی سەرلەبەیانی بوو کەوتمەوە دەریای خەیاڵ و بیرکردنەوە لە حاڵی خۆم و پرسیارم دەکرد وا هەر بۆ خۆشم وەك دڵخۆشی دانەوەیەك برگە پرسیارێکم بۆ خۆم دەدایەوە ! بۆنمونە !! دەم ووت :ـ باشە خۆمنیان بۆ دووکاتژمێر کەمتریش هێنابوو ووتیان (محمد موراد) پێویست ناکات پێڵاو لە پێ بکەیت وجل وبەرگەکەشت بگۆڕیت ؟! چەند پرسیارێکمان هەیە و هەر ئێستا دەتگێڕینەوە بۆ ماڵ ..؟

کەچی ئەوە (٢٥)پیست و پێنج ڕۆژ دەچێ لەم زیندانەدام و هەر ئەم چەند ڕۆژە کەمەی کە ڕابورد ئەشکەنجەو لێدانم نەبوو ؟!

ئەگینا هیچ شەوو ڕۆژێك نەبووە من بێ ئەشکەنجەو لێدان ڕزگارم بوبێت ..؟! ئەو چەند ڕۆژەش کە خۆم ئەشکەنجە نەکراوم دیمەنی ئەو منداڵانەم بەو شێوەیە دی لەگەڵ ئەو کچانە ؟بە تەواوی خۆمم لە بیر چووبووەوەو خۆزگەم دەخواست کە هەر ئەشکەنجەی خۆم بەردەوام بوایەو ئەو دیمەنە ناخۆش و دڵتەزێنانەم نەدیبایە ! چۆن دەڵێن ئەشکەنجەی دەروونی گرانترو سەخترە بۆ مرۆڤی وشیار و بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕانە ..؟!

ئەو دیمەنانە بە تەواوەتی پەرێشانیان کردبووم ئازاری بەردەوامم پێوە دەداو کینگڵم دەیا لەتاو ئەو جۆرە ئەشکەنجەدانەو بێ مافیە لەگەڵ کوردا دەیکەن ئای .. کوردی چارە سیا تاوەکو خاوەنی ئاڵای شەکارەی خۆت نەبی تۆش وەکو گەلانی تری ئەم سەر زەمینە نیشتمانەکەت سەربەخۆ نەبێ ئەوا سەراپای ژیانی هەموو کودرێکی نیشتمان پەرەوەری دڵسۆز بەخاك و

نیشتمانی کوردستان هەر ئەبێ بە ئازارەوە بژین .؟ بۆ خۆ هەڵخستن و خۆر لێدانێك و هەوایەکیپاك هەڵمژین ! نزیکەی کات ژمێر(١١)یپێش نیوەڕۆ کردمیانەوە بردمیان بۆ حەوشەی زیندانەکەوە ؟!

هەلێکی باشم بۆ هەڵکەوت ! دەبا پرسیارێك بکەم لەم (ژنە) بە دیمەنی ڕوخساریا دیاربوو ئەشکەنجەی زۆری دیوەو زۆر بەوە دەچێ ئازاری بێ ئەندازەی درابێ ؟

کەوتمە قسەکردن لەگەڵیا ..

*خوشکە گیان چۆنی !؟

-زۆر سوپاس ..

*ئەوەچی دەکەیت لێرە لەناو ئەم زیندانەدا..؟

-زیندانم ! باوکەکەم ؟

*بۆچی ..؟ لەسەر چی گیراویت و زیندانی کراویت ؟

-بەتاوانی ئەوەی کە دایکی پێشمەرگەم بۆیە گیراوم و زیندانی کراوم و هیچی ترا

*دایە گیان ڕاستە کوڕت پێشمەرگەیە ؟ئەی ئەگەر پێشمەرگەش بێت

- بەڵێ ڕاستە برا باشەکەم ؟

*دەتوانم بزانم خەڵکی کوێیت و ناوت چییە ؟ چەندە زیندانی کراویت ؟

-خەڵکی دوز خورماتووم لەگەڕەکی جمهوری .. ناوم (حەلیمە عزیزە) ماوەی سێ مانگە زیندانییان کردووم !!کەس و کارم نازانن لە کوێم و تاکو ئێستا کەسم نەدیووە جگە لەوانەی کە دێن پرسیارم لێ دەکەن و لێم دەدەن و جنێو قسەی سوك و ناڕەوام پی ئەدەن ؟

-ئەی تۆ چیت لێرە باوکەکەم ؟

*منیش وەکو تۆ زیندانیم ،! ئەگەر هەر پێویستیەکت هەبوو پێم بڵێ بەڵکوو بتوانم بۆت جێ بەجێ بکەم ..بەپێی توانای خۆم ئەوەی لە دەستم بێ وەك خواردن و جل و بەرگ کە یەکێکمان بەربێ دەتوانین بۆت دابین بکەین ؟
-ڕۆڵە گیان .. تۆش وەك من زیندانیت ، دەتوانی چیم بۆ بکەیت ؟ سوپاست دەکەم ڕۆڵە گیان ؟
بەڵام ئەگەر زووتر ڕزگارت بوو ئازاد کرایت دەنگ وباسم بگەیەنە بە کەس و کارم ئەوە گرنگترین یارمەتی‌یە بۆمن کوڕە شرینەکەم ؟
بەڵێ دووبارە کراینەوە ژوورەوە بۆ ناو زیندانەکە لە دەروون دا زۆر بێزار و ئازارم هەبوو کە بیرم دەکردەوە کات بە کات ئێش و ئازارەکەم زیاتر دەبوو ؟!
نەتەوەی کورد بۆچی وابوو بەئاردی ناو درك هەر یەکە بۆلایەك و هەریەکە گیرۆدەی گیرو گرفتێك بووە ؟! ئای ئەم کوردە چۆن گیرۆدەی ئەم دوژمنە داگیر کەرەبووە ؟! گوندو کانیاو و دارو کێڵگەو زەوی و کشتوکاڵی و ئاژەڵ داری و هەتا هیچ نەما لە کوردستان دا هەمو بە جاری ڕامالێن ئاخنیونێتە ناو ئۆردوگا زۆرە ملێ کانەوە کە هەر لە شێوەی زیندانێك دەچێ وخەڵکەکەی بێ کارو کاسبی ماونەتەوەو تاوەکو تەمەڵ و بێکاریان بکات ؟
لە هەوڵێکی ئەم دڕندانە بەو سنورو چوار چێوە دانان بۆ ئەو خەڵکە هەژارو ستەم دیدە ؟! دەربەدەر کردن و دورخستنەوەی خەڵکی شۆڕشگێڕو خەبات کار بۆ شارە عەرەبەکانی خوارووی عێراق و خستنە ژێر چاودێریانەوە ئەوە جگەلەوەی کە زیندانەکان پڕە لە پیرو منداڵ و لاوی ئەم کوردە بی چارەو کوڵەکراوە ! هەر دەبێ ئێمەش ڕۆژێکمان بۆ ببێت و بگەین بە مافی خۆمان و ئازاد ببین ؟
هەر دەبێ ڕۆژێك بێت و دەوڵەتی کوردیش بێتە کایەوەو ئالای ڕەنگینی بشەکێتە

ئەوە ئاواتیبەرزی هەمووکوردیکی حاوەن

هەڵوێستە ئەگەر چی هەندێك حاڵات ناتوانرێت وەکو پێویست

دەری برێت ؟ بەڵام ئەو هەڵوێستە کورد پەروەرانەیەی مرۆڤی کوردی

شۆرشگێر هەمیشە ئەو خەسڵەتە کورد پەروەرییەی لە هەست و نەستی

خۆیدا .

هەمیشە کینگلی پێوە دەدات ، چۆن دەزانی ، ئەو هەستە شۆڕشگێڕییەی

کورد پەروەرێك لە ئایندەیەکی دوور یان نزیك دا بێت هەردەبێ ئامانجی

سەرەکی نەتەوەی کورد هەر بێتەدی ..

ڕژێمی عێراقیش بۆ زیاتر فراوانکردنی پانتایی دەسەڵاتی شۆڤێنستانەی

هەر لە سەرەتای هەڵایسانی شۆرشی نوێی گەلەکەمان ، بەعس ،

بەبەرنامەیەکی سەربازیو پاوان خوازیەوە دەستی کرد بە ڕاگوێزانی چەندین

زانای ئاینی لە باشوری عێراق و دەرکردنیان و ڕەوانەکردنیان بەبێ ئەوەی

هیچیان بۆ دەربچێ ڕای گواستن بەرەو سنوری نێوان عێراق و ئێران ..

لەوانەش ، چەندین کەسانی شۆڕشگێڕی کوردستان کە لە نسکۆی شۆڕشی

ئەیلول دا ، ڕای گواستن بۆباشووری عێراق تاوەکو بۆ دوا جار لە داوی

ڕێکەوتنامە شوومەکەی جەزائیر بڕیاری توانەوەی شۆڕشێکی چەند سەد

هەزاری پێشمەرگەیان دەرکرد ، بەمەش دوژمنەکانی کورد ، هەمیشەو

بەردەوام لە بۆسەی نامرۆڤانەدا بوونە بۆگەڵی کوردی بن دەست .. و چەندین

بەربەستی سیاسی و ئابووری و سەربازی و جەنگی سایکۆلۆژی لە دژی

تاکی کوردی بکەن ..

من لەناو ئەم خەیاڵانەی خۆمدا وەکو خەوتوو بێ هۆش کەوتووم .. ئیتر

نازانم چەندی خایاند ... ؟!

ئەوەندەم گوێ لێ بوو بانگیان کردم ، (محمد موراد) بانگت دەکەن ،؟

ڕاچەڵەکیم سەیرێکی زیندانییەکانم کردو وتم بەڵێ .. بەڵێ ! ئەوە کێ بوو

بانکی لێ کردم ؟! ئەوە چی بوو بانکی منتان کرد ..! لە دەرگاوە بانگت دەکەن ..؟!

(محمد موراد) ..! بەڵێ دیسان هاتنەوە بۆ ئەشکەنجەو ئازار دانم بەڵێ قوربان .. بەڵێ ..؟ کابرای پاسەوانی جەللاد پێی ووتم :ـ خۆت کۆبکەرەوە ، چونکە بڕیاری لێبوردنت بۆ دەرچووە ؟! وە ئازاد دەکرێی .. دەی خێرا دەرچۆرە دەرەوە ..

باوەڕم بەم قسەیە نەئەکرد ، چونکە دەمزانی‌ئەو تاقمە خوێن ڕێژەی بەعس هەرچی سوکایەتیەك هەبێ ، بە مرۆڤەوە دەیکەن .. بە تایبەتی کورد .. بەڵام بابزانی ئەم جارە چۆن دەبێ ..!

*محمد موراد .. !

-بەڵێ

*خێراکەو وەرە دەرەوە ..؟

-منیش لەناو زیندانی‌یەکاندا نەم دەزانی چی بکەم .. لە دڵی خۆمدا ئەمووت :. ئەمجارەش هەر بەم سیناریۆیە بزانم چی لەگەڵم بکەن .. بۆیە هاتمە دەرەوە .. ووتم بەڵێ فەرموو .. بردمیان بۆ ژوورێك و کابرایەکی تەنگە ئەستووری ڕەش پێست دانیشتبوو ، حەمە موراد ئەوە لێبوردنت بۆ دەرچووە لەلایەن حکومەتی نیشتمانی باوکەوە ..! ها بزانە حکومەت چەند بەبەزییە بەرامبەر بە نەوەکانی خۆی ؟! دەبێ ئێوەش وا بن ، وەرە پێشەوە ئەم پەڕاوەمان بۆ ئیمزا بکە ؟!

-منیش پێم گووت :ـ گەورەم نووسراوی چی ئیمزا بکەم هەر لەخۆمەوە ، ئەی نابێ بزانم چی‌یەو بۆچی‌یە ؟! ئەویش لە وەڵامدا ، ووتی ، ئەمە نووسراوی ئاسایی‌یەو هەر کاتێك کەسێك ئازاد دەبێت وەك تۆ دەبێ ئیمزای بکات بۆ ئەوەی کە بەڵێنی ئەوە بدات کە هیچ کارێکی ڕامیاری کە دژ بە حکومەتە ، ئەنجام نەدات و وەنەگەر بە نهێنی کاری سیاسی لە دژی

حکومەت کرد ، ئەوا بە پێی ئیمزاکەی خوی دەچیتە بەرپەتی سێدارەو لە سێدارە دەدرێی ؟!

ووتم باشە ، خۆمن کابرایەکی بێ تاوانم و هیچ کارێکی خراپ و ناڕەوام لەسەر نی‌یەو کاری سیاسی دژ بە حکومەت هەر نازانم چی‌یە ئیدی بۆ دەبێ ئیمزای بکەم ؟! وەپێویست بە ئیمزای من ئەکات دیارە شتێکی هەر بۆ ئەدۆزنەوەو بێ مەلامە نی‌یە ئەم ئیمزایە ؟! بە شێوەیەکی زۆر ناشرین کابرای سەر بە ڕژێم ووتی .. ها حەمە موراد ئەمەش مەکە بە ڕۆژانی تر ، وەرە کە هەر کەللە ڕەقیت دەنواند ! دەی وەرە پێشەوەدەی وەرە پێشەوە ئیمزای بکەو بڕۆرەوە بۆماڵەوەو لەوەزیاتر خەریکمان مەکە ، دەنا دەتنێرینەوە بۆ ناو زیندانەکە ؟!

ئیتر منیش((بڕیاری خۆم زۆر لە پێشتر دابوو ، کە ئەم حکومەتە عەرەبە بەعسی‌یە دوژمنە داگیرکەرەی نەتەوەکەمان ، ژیان لەگەڵ ئەم جەللادانەدا زۆر سەخت و دژوارەو ئاسان نی‌یەو هەرگیز ناکرێ)) ؟

هەر بۆیە ئیمزام کرد بۆیان ! چونکە ژیان و مانەوەی ژێر دەستەیم ئیتر تەواو ..؟

-کابرای بەرپرسی زیندانی ڕژێم بە هەڕەشەیەکەوە پێی‌ووتم ، ها حەمە موراد هەروەك پێشتریش پێت ڕاگەیەنراوە . باسی هیچ شتێك ناکەی لەدەرەوە لەگەڵ خەڵك کەچی بووە ؟!

یا چی کراوە لەگەڵ زیندانی‌یەکان و یان هۆکارەکانی ڕووداوەکانی ئێرە ، چیان پێ ووتویت ، ئەوە هەمووی دەبێ کەس لێت نەبیستێ و لەگەڵ کەس باسی نەکەی ؟! دەنا خۆت نابینیتەوە ئەمجارە کە بگیرێیت و وە ڕزگاربوونیشت مەحاڵە ، ئەو پێمان ڕاگەیاندی کە بڕیاری حکومەتی نیشتمانی‌یە پاشە ڕۆژ هەرچی‌یەك بدرکێنی ، ئەوە گوناهی خۆت لەملی خۆت ؟!

(منیش پێم ووت بەسەر چاو ، ئەمر دەفەرموون)
-ئەویش ووتی ئە ئیتر ئازادی ، بچۆرەوە بۆ ماڵی خۆت بەبێ چەندو چوون .
*(هەرئەوەندەی لە دەرگای سەرەکی هاتمە درەوە ، وام دەزانی خەو دەبینم و بڕوام بە مانە نەدەکرد ، چونکە ئەو ڕژێمە هەرگیز بڕوای بەپەیامی مرۆڤایەتی نی‌یە .. بەڵام سەیرێکی خۆم کردوو هەوایەکی پاکم هەڵمژی و بەرەو ماڵەوە ملی ڕێگام گرتەبەر چومەوە ماڵەوە ..؟ بە گشتی ماوەی (٢٥) ڕۆژ بەند بووم لە دەزگای بەدناوی (هەیئەی کەرکوك)
بۆ کاتژمێر نزیکەی (٤) چواری پاش نیوەڕۆ کە لە دەرگای زیندان هاتمەدەرەوە ... بەرەو ماڵی خۆشەویستی خۆم ..
بەڵام هەرگیز لەو بیرو باوەڕی کوردانەیەم پاش گەزنابمەوە هیچ شتێك لە درۆخراپتر نی‌یە لەگەڵ خۆت بیکەیت ؟! ئەو کەسەش سەرلێشێواوە کە درۆ لەگەڵ گەلەکەی خۆی بکات هەرچەندە ئازاد کرام ، بەڵام ئێستاش هەر لەسەر بڕیاری خۆم ئامادەم کە تا دوا تنۆکی خوێن لەجەستەم دا بێت بۆ خزمەت کردنی خاك و نەتەوەکەم ژیانی خۆم خەڵات بکەم بۆیە ئەگەر خزمەتی نیشتمانەکەم نەکەم و خاکی پیرۆزی کوردستان ڕزگار نەکەم لەچەکمەی پۆستاڵی داگیر کەران ئیدی خزمەتێکی بکەم .. وەبەهێزترین خۆشەویستی ، خۆشەویستی نیشتمانە .
هەروەك زانایان ووتوویانە ..
هیچ کەس تف لە ڕیشی خۆی ناکات ، بۆیە هەر کەسێکیش ڕوو لە میللەتی خۆی و خاك ونەتەوەی خۆی وەرچەرخێنێ و دژی نەتەوەکەی سەنگەر بگرێ و بوەستێتەوە .. ئەوا دەچێتە زبڵ خانەی مێژووی سەرجەم مرۆڤایەتی‌یەوە

وە داری ووشك قەت بەرناگرێ و بێ سوودەو بۆ بڕینەوە چاکە ..

لە زیندان و ئەشکەنجەی نامرۆڤانەی بەعسی‌یەکاندا فێری ئەوە بووم . کە گەورەترین خزمەت خەبات و تێکۆشانە لە پێناوی ڕزگاری گەل و نیشتمانە کەماندا لە چنگی داگیر کەران ڕزگاری بکەین .. هەروەك ڕەسووڵی هەمزا تۆف لەکتێبی بە ناوبانگی پڕ لە مەعریفەدا پێمان دەڵێ : (کاتێك نیشتمانەکەت دەسوتێنرێ ئەو کەسەی لە پشتی ئاگردانەوەبێت پیاو نی‌یە ئەو خەنجەرەی لەناو کێلاندا بێت خەنجەر نی‌یە )...

بۆیە لەم چەمکە مەعریفی‌یەوە تێ دەگەین .. کە پیاوی ترسنۆك هەمو ڕۆژێ بەسەر شۆڕی دەمرێ و پیاوی ئازاو شۆڕشگێڕیش تەنها یەك جار مردن هەڵدەبژێرێ ، لە پێناوی ڕزگاری یەکجارەکی بۆ گەل و نەتەوە ژێر دەستەکەی ..

کە ژیانی نەتەوەکەم بە ئازادی نەژی ئەوا مردنی سەربەرزی گەلی بەنرخترە لە مردنێك کە هەموو ڕۆژێ دەمرێت و زیندوو دەبێتەوە بۆیە دووبارەو هەزار بارە ئەو پەیمانەی داومە دەبێ داکۆکی لێ بکەم سوێندم بە خوێنی شەهیدانی ڕێگای ڕزگای کورد و کوردستان بە خاکی پیرۆزی نیشتمانە زامدارەکەم کەلەسەر ئەوە ڕێگەیە درێژە بە کاروانی خەبات و تێکۆشان بدەم و دروشمی نەسرەوتن تا سەرکەوتن بکەمە مانیفێستی ژیانی ئازاد و سەربەخۆ بۆ گەل و نەتەوەکەم ماوەتەوە بڵێم بە نەوەکانی گەلە سەر بڵندەکەم کە ئەوەی لە زیندان و لە ژێر ئەشکەنجەدا بردوومەتە سەر بە قەد تاڵە دەزوویەك کار لەو ڕێبازەم ناکات بەڵێن بێت نەسرەوم تا گشت ئامانجە ڕەواکانی گەلەکەم دێتە دی لەسەر ڕێبازی پیرۆزی کوردایەتی‌و خۆشەویستی خاك و نیشتمانی کوردستان زیاتر و زیاتر شێلگیرتربم وەهەر چەندە چەوسانەوەو زوڵم و زۆرداری هەبێ بەڵام خۆری ئازادی و سەرفرازی گەلەکەم دەبێ لە کەلی چیا سەرکەشەکانی کوردستانەوە ڕۆژێکی نوێمان بۆ بێنێ .

وە دەبێ لەو ڕاستی‌یەش باش تێ بگەین هەرچەندە زیندانی ئەشکەنجەدان لەلایەن داگیرکەرانەوە زیاتر بێ بەڵام بۆ مرۆڤی خۆڕاگرو شۆڕشگێڕ بیرو بۆچونەکانی بە هێزتر دەبێ بەرامبەر بەنەتەوەکەی .. وە ڕق ئەستوور تریش دەبێ بەرامبەر داگیرکەری بەعسی فاشی .. وە هەر مرۆڤێکی شۆڕشگێڕ بڕوای نەگۆڕی بەم چەمکە هەبێ کە دەڵێ :-

هەر کاروانێ بەرەو خۆری ئازادی بڕوانێ کەم بێ یا زۆر ...دەگەن بە خۆر

دەی کەواتە ئێمەی کوردیش مافی خۆمانە وەکو میللەتانی تری جیهان بە سەربەستی و ئازادی بژین و هەوای سەرکەوتنی یەکجارەکی لە نیشتمانی کوردستانەکەمان دا هەڵمژین و ئەوکات ئاسوودە بین پەرە بە ژیانی هەمەلایەنەی کوردستان بدەین ..! بەڵام ئەوەی زۆر بیرو هەستی داگیر کردووم ڕۆڵی خۆڕاگری‌وقارەمانی (کاك عبدول ڕەحمان) کە هەموو جارێ وورەی دەدا بە من بۆیە دەڵێم سەد ئەفسووس ئەو لە سێدارە درا و ئازایانە خۆی ملی نەوی نەکرد بەڵکو پەتی سێدارە نەویەوە و کرایە گەردنی و نەمری بۆ خۆی تۆمار کرد ..

هەروەك نووسەر دەڵێ :-

هەزاران ، وەك محمد موراد ئەشکەنجەدران<br>
لە گۆشەی زیندان لاشەیان بزمار ڕێژکران<br>
خەو و خۆراکیان بە جارێ لێ تۆران<br>
پەتی سێدارەیان لە بۆ هەڵنەخران.

بێ ئەوە ڕزگار نابێ وەك باوە لە کوردان<br>
هەزار ساڵ ژیان .. قەوارەت نەبێ ئەبی‌ماڵوێران<br>
کەواتە نامەوێ بۆچیمە بەوشێوەیە ژیان

نووسەر/سید قادر جەباری

**٢٥ڕۆژ لە زیندانی فاشستەکانی بەغداو هەڵوێستێك ...**

نووسەری بەڕێزو تێکۆشەرێکی دێرینی خەباتی ڕزگاری نیشتمانی کوردستانە زامدارەکەمان لە ڕێگەیەکی واقع بینانە سەرگوزشتەو بەسەرهاتی قارەمانێکی گەلەکەمان لە نێو زیندانی فاشی یەکانی بەعس دا ، لەزاری قارەمانی ڕاستەقینەی ئەو ڕووداوەوە ، کردارە نامرۆڤایەتی یەکانی ڕژێمی عێراق لە شێوەی دیکۆمێنت دا ئاشکرا دەکات و لە ڕێگای نووسینەکەیەوە ، بە جیهانی ڕادەگەیەنێ کە میللەتی کورد لە نیشتمانی زێدی باب و باپیرانی خۆیاندا .. تەنها دەیانەوێ بەسەربەستی و دوور لە هەموو شێوازێکی داپڵۆسین و جینۆساید ، بە ئازادی بژین ، ژیانێك کە لە سەر بنەماکانی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ دا داکۆکی لە مافی مرۆڤ دەکا تاوەکو ئاسوودەو بەختەوەر بژین و خاوەنی قەوارەیەکی سیاسی کوردی خۆیان بن...

کتێبی (٢٥)ڕۆژ لە زیندانی فاشی بەغدادا ، گوزارشت لە هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر دەکا کە دڵسۆز بێت بۆ خاك و نەتەوەکەی وە بە میتۆدێکی شۆڕشگێڕانەوە ، بەرگری لە بوونی کورد بکاتەوە ، وە لە نێو زیندانی فاشیزم دا نەك هەر چۆك دانات ، بەڵکو بە پرەنسیپێك پەروەردەکراوە کە ڕێگای سەد هەزار میلی هەر بە تاقە هەنگاوێکی شۆڕشگێڕانەوە دەست پێ دەکات وئازار و ئەشکەنجەی دوژمن لە تەك زیندانی یە کوردەکان دا ، نەك هەرژۆکیان پیادانادەن ، بەڵکو دەبنە لوتکەی بەرزی خۆڕاگری و نەبەزین و بەرخۆدان وە ئەم کتێبە ڕووی دزێوی دەزگاداپڵۆسینەرەکانی بەعس باس

ئەکات لە جوانیی دا بە هیوای ئەوەم نووسینی ئەم بەسەرهاتە واقعیانە ،
کەسایەتی کوردی پێ بناسرێت لە وڵاتانی دەرەوە
دەست خۆشی لە قەڵەم و تێکۆشانی زیاتر لە (٢٠) ساڵ خەبات و تێکۆشانی کاک سەید قادر جەباری دەکەم و بە توندی دەستە ئازاو ئازادانەکەی دەگووشم و هێندەی تر قەڵەمەکەی بە پڕشت بێ لە پێناوی مافی ڕەوای نەتەوەکەمان ...
وەبرای بەڕێزم کاک سەید قادر جەباری ـ نووسەرو شۆڕشگێڕ زیرەکانەو لەسەر میتۆدێکی شۆڕشگێڕانە ، واقی ژیانی سیاسی مرۆڤی کورد لە زیندانی بەعس دا بە دنیای ناوەوەو دەرەوە دەناسێنێ و بە نووسینی ئەم کتێبەی هەموو لایەنێکی سیاسی و نیشتمان پەروەری کورد بەرەو ئەوە دەبات ، کە مێژووی ڕووداو و کارەساتە تراژیدیاکانی ئەم گەلە سەربڵندە لەبیر نەکەن و خەمخۆری ڕاستەقینەی مەسەلەی ڕەوای گەلی کورد بێ دۆست و دوژمنانمان باش بناسن ...!

برات

جەمال نوری

کوردستان ـ سلێمانی

## ژیانی نووسەر لە چەند هێڵێك دا

ناوی نووسەری (کتێبی ٢٥ڕۆژ لە زیندانی فشیەکانی بەغدا)
قادر محمد جەبارییەو ناسراوە بە سەید قادر جەباری لە ساڵی ١٩٤٧دالە شاری کەرکوکی زێڕی ڕەش و پایتەختی کوردان دا هاتووتە دنیای پڕ لە چەوسانەوە لە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێڕ و نیشتمان پەروەرەو خاوەنی

دووبرای شەهید و ئەنفال کراوە ئاستی خوێندنی نووسەر دەرچووی پۆلی شەشەمی ئامادەی بەشی ئەدەبی تەواو کردووە ..
ئەو کاتەی شۆڕشی ئەیلول هەڵایسا ، برای نووسەر وەك مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر و خۆنەویست بۆ بەرگری کردن لە مافەکانی گەلەکەمان پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلولەوە کردووەو یانزە ساڵ چ وەك پێشمەرگەو چ وەك کادرێکی وریشیار بەشداری لەو شەڕەدا کردووە .
دوای هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول ، وهەڵگیرسانی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان لە ساڵی ١٩٧٦دا پەیوەندی کردووە بە ڕیزەکانی بزووتنەوەی سۆسیالستی کوردستان و بی نووچ دان لە خەبات و تێکۆشان وبەرگری شۆڕشگێڕانەدا بووە لەگەڵ ڕەوتی ڕووداو و گۆڕانکاری‌یەکانی‌دا لە ناو شۆڕش و ژیانی سیاسی‌یانەی درێژەی بە ڕێبازی هاوسەنگەران و شەهیدانی حزبی سۆسیالستی دیموکراتی کوردستان پێداوە تا ئێستا .
وە بە هۆی ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتی‌یەوەبۆماوەی هەژدەساڵ دوور بووە لە ماڵ و منداڵەکانی‌و وە دوژمنیش بۆ چۆك دادانی زۆربەی جار هەڕەشەی گرتنی لە ماڵ و منداڵی کردوەو بۆ فشار خستنە سەرشیان هەواڵ و دەنگ و باسی ئەوەیان ڕاگەیاندووە کە مردووە ..
بەڵام وورەو خۆڕاگری شۆڕشگێڕانەی هیچ کات لە ورەی دانەبەزاندووە .. وە ماڵ و منداڵەکانی لە ژیانێکی سەخت و دژواردا ژیانیان گوزەراندووە .. دوو جار خانووی ڕوخێنراوە لە کاتی دەسەڵاتی (عبدالکریم قاسم) و جارێکی تریش لە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١لە کەرکوك خانووی سوتێنراوەو کەرەسەی ناو ماڵی بە تاڵان براوە لە لایەن پیاوانی ڕژێمی بەعسەوە ..
هیچ کات بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کاری نەکردووە هەمیشە لە بەرژەوەندی شۆڕشی کوردا لەسەنگەری تێکۆشان دا بووە .

بـه هـۆی ژیـانی سیاسـی و پێشـمەرگایەتی خۆیـەوە دوژمـن دڵڕەقانـە نەیهێشـتووە کـوڕو کچـەکانی لـە خوێنـدن بـەردەوام بـن وە لـە ژیـانی پێشـمەرگایەتی‌دا بـرای نووسـەر وەك کـادری پێشـکەوتووی حزبـی سۆسیالسـتی دیموکراتـی کوردسـتان و وەك سـەرکردەیەکی بـەوەفاو خۆنەویست ، چەندین جار کەوتووتە کـەمینی دوژمنـەوە و سـەرکەوتووانە ئەرکەکانی حزبی لە پێناوی ڕزگاری نەتەوەکەی‌دا بە ئەنجام گەیاندووە .

لە ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١یش دا برای بەڕێز و سەرکردەو نووسەر لە ناوشاری کەرکوکی کـوردان دا لـە نزیـك نەخۆشـخانەی (صـەدام) دا زۆر بەناڕەحەت توانیویەتی زیرەکانە خۆی و پێشمەرگەکانیشی ڕزگار بکات .

وە لە شەڕەکانی قەڵخانلوو ئاغجمبەشـەت و زەمبووردا لـە سـاڵی ١٩٧٤دا لـە بەر ووشیاری و زیرەکی خۆیـەوە توانـی لـە کەمینی جاشەکان قووتـار بـن ، بەڵام لەبەر ئەوەی گوند بە گوندی ئەو ناوچەیە بـەجاش تـەنرابوو ، پـاش زەرەروو زیـانێکی زۆر لـە دوژمـن ، پێشـمەرگەیەك کەبـە نـاوی (مجیـد شەوکەت)ەوە بریندار بوو لەگەڵ کەسێکی خزمیان بە ناوی کاکە مین توانیان بیگەیەننە نەخۆشخانەی شۆڕش و چارەسەرکرا.

برای نووسەر کاك (سید قادر جەباری) چەند زمانێکی تـر دەزانـێ جگـە لـە زمانی ڕەسەنی کوردی .

زمانی عەرەبی ، زمانی تورکی ، زمانی فارسی ، زمانی نەرویجی